



# دیوانی فایق بێکەس



محەمەدی مەلا کەریم

دیوانی بێکەس

محەمەدی مەلا کەریم

تایپ: حامید جیهانی

دیزاینی بەرگ و ناوەرۆك: شاروخ ئەرژەنگی

تیراژ: ۲۰۰۰ دانە

چاپی دووەم ۲۰۱۱

ژمارەی سپاردن: (۱۲٤۹) ی ساڵی ۲۰۰۸ی وەزارەتی رۆشنبیریی دراوەتێ.

زنجیرە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی شڤان ژمارە ۲۷

# وتەیەکی کورت بۆ ئەم چاپە تازەیەی دیوانی بێکەس

خوێنەری بەرێز!

لە سەرەتای حەفتاکانەوە هەتا ئێستە دیوانی بێکەس چەندین جار چاپکراوەتەوە وا ئێستەیش چاپخانەی شڤان لە سولەیمانی ئەم چاپە هەرە تازەیەمان پێشکەش ئەکات. ئا لێرەوە ئەمەوێ بپرسم ئەم هەموو چاپ کردنەوەیەی دیوانی بێکەس، کە رەنگە لە چاپەمەنی کوردیدا نموونەی نەبێت یان دەگمەن بێت، لە چیەوە هاتووە؟! بێگومان لە خۆشەویستی بێکەس و شیعرە چاونەترسەکانیەوە هاتووە. لە چون یەکی هەڵوێست و قەڵەمیەوە و لەسووتانی ئەوەوە بۆ چارەنووسی نەتەوەکەی و لە راستگۆیی دەربڕین و هەستی پاکی ئەوەوە سەرچاوەیان گرتووە. بێکەس بەمانای وشە شاعیرێکی میللی و نیشتمان پەروەری سەردەمەکەی خۆی بووە. لە دوای شاعیری گەورەی میللیمان، حاجی قادری کۆییەوە، ئەم هەڵگری هەرە دیاری مەشخەڵەکەی ئەو بووە. شیعر لای بێکەس پەیامێکی قەومی بووە و لەو رێگەیەوە ویستوێتی بیر و ئەندێشەو خولیاکانی خۆی بگەیەنێتە زۆرترین خەڵکی وڵاتەکەی. بێکەس ئەوەندەی گەیاندنی ئەو پەیامەی لا مەبەست بووە کەمتر ئاوڕی لە جوانکاری‌و هونەرو فانتازیای شیعر داوەتەوە. وەك ئەوەی بە کڵپەی ئاگر شیعری نوسیبێ وا بووە. شیعر لای بێکەس گفتار و کرداری بە موو لە یەکتری جیاوازییان نەبووە. یەکێك بووە لە سەرکردەکانی راپەڕینی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ و بریندار بووە و گیراوەو دوورخراوەتەوە. ژیانی بریتی بووە لە رەنج و تێکۆشان و لەو پێناوەدا هەموو ئازار و دەردەسەریەکی چێشتووە. بێکەس مامۆستای سەرەتایی بووەو چەندین نەوە لەبەر دەستی ئەودا فێری خوێندەواری بوون و بە هۆی سروودە نیشتمانیەکانیەوە بیری کوردایەتی و نیشتمانیی لە دڵدا چاندوون. هەروەها بێکەس یەکێکیشە لە رێبەرە هەرە دیارەکانی خاوەن بانگەوازی رووناکبیری و شارستانی بۆ داواکردنی ئازادی و یەکسانی و مافی ژنان، شیعری "نەسرین دەمێکە"ی ئاوێنەیەکی بێگەردی ئەو بیروبۆچوون‌و رووناکبیریەی ئەوە بۆ راپەڕین و هاندانی ئافرەتان تا شان بە شانی پیاوان ئەوانیش بێنە مەیدانی تێکۆشانەوە. بێکەس لە ژیانی خۆیدا زۆر جار رووبەڕووی فیکری دواکەوتووی ئایینی و کۆمەڵایەتی بۆتەوەو لەم بارەیەوە چەندین شیعری مەشخەڵ ئاسای داگیرساندووەو لە تاریکستانی ئەو سەردەمانەدا لەگەڵ خۆیدا گێڕاونی و خەڵکی پێ هوشیار کردوونەتەوە. "گۆران"ی گەورە لە قەسیدە بەناوبانگەکەی "هاوڕێم بێکەس"دا زۆر بە وردی و بە زمانیچکی شیعری چڕوپڕ

تابلۆی ژیان و بیرو تەنانەت شێوەی "بێکەس"ی نیشانداوین. شیعری بێکەس شیعری لە دڵەوە بۆ دڵ بوون. شیعری ورياکردنەوەو هاندان بوون بۆ ئەوەی خەڵکی کۆت و پێوەندی دواکەوتن‌و ژێردەستی بشکێنن. بەشێك لە هەڵوێست و کردەوەی ئازایانەی بێکەس بوون بە چیرۆك و تا ئێستەیش لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ئەگێڕینەوە، بە تایبەتی، ڕووبەڕووبوونەوەی بێکەس لەگەڵ "ئەدمۆنز"ی راوێژکاری ئینگلیز لە وەزارەتی ناوخۆی ئەو کاتەی عێراقدا، ئەو وەختەی دێ بۆ سلێمانی و بێکەس ئەو فرسەتە لە دەست ناداو لە گردی یارەو لە نەورۆزی ١٩٤٦دا شیعرە بەناوبانگەکەی "٢٧"ساڵەی لە بەردەمدا ئەخوێنێتەوە. "بێکەس" خۆی وەك خێزان‌و بنەماڵە "بێکەس" نەبووە ئەم نازناوەیش لە بێکەسی میللەتەکەیەوە بۆ خۆی هەڵبژاردووەو بۆ ئێمەیشی بەجێهێشتووە. کەسایەتی بیچکەس ئاوێتەیەك بووە لە ئەبونەواسی شیعرو بادەو لە حاجی قادرێکی تازەو لە سروودی نەتەوایەتی و لە یاخیبوونی بەردەوام‌و لە عیزەتێکی نەفسی ئێجگار بڵند، لە لایەکی تریشەوە "بێکەس" پیاوێکی قسە خۆش‌و دەم‌و دوو پاراوو لە وەلامدانەوەدا حازربەدەست بووە. "بێکەس" ماڵی دنیا نەویست بووە. زمانی بەشێك لە شیعرەکانی زمانی ڕەخنە بوون. ڕەخنە لە کۆمەڵ، لە داب‌ونەریت لە هەموو ئەو دیاردانەی کە بۆ نیشتمان و خەڵکی بووبوونە مێردەزمەی قێزەونی سەرسنگ. بۆ هەموو ئەوانەی کە بازرگانییان بە خوێن‌و ڕەنج‌و ژیانی میللەتەکەیەوە کردووە. شیعر لای بێکەس تەنها ئامرازێ بووە بۆ ئەوەی بیرو هەڵوێستی خۆی بەرێتە ناو بەرفراوانترین جەماوەری کوردستانەوە. "بێکەس" یەکێك بووە لەو ڕووناکبیرانەی کە زمانی عەرەبی زۆر چاك زانیوەو وەك ئەڵێن بەشێکی زۆری شیعری ئەبونەواس و موتەنەبی و ڕەصافی و زۆری تری لەبەر بووە. ئاگاداری بزووتنەوەو شیعرە شۆڕشگێڕەکانی سەردەمی خۆی بووە. بە وردی ئاگای لەو پەیامە بووە کە "قاسم ئەمین"ی عەرەب بۆ یەکەمجار لە بارەی ئازادی و ماڤ ژنان و یەکسانیەوە بلاوی کردبۆوە. ئەگەرچی بێکەس کەم ژیاو تەنها ٤٣ ساڵ تەمەنی بوو وەختێ ماڵئاوایی لە ئێمە و میللەتەکەی کرد. بەلام ئەو لە رێگەی شیعرە ئازاکانیەوە لە ڕێی هەڵوێستی پاك و بێگەردی خۆیەوە لە دڵ و دەروونی میللەتەکەیدا بە زیندوویی ئەمێنێتەوە.

شێرکۆ بێکەس

سلێمانی ٢٠٠٨/٣/١

# ئەم دیوانە

## سەرەتای چاپی یەکەم[١]

ئەمە یەکەمجار نییە دیوانی (بێکەس) لە چاپ ئەدرێ، بەڵام یەکەمجارە ئەکەوێتە بەردەمی خوێندەواران. لە پاش شۆڕشی تەمووزیش جارێکی تر شیعرەکانی "بێکەس" کۆ کرانەوە و خرانە بەر چاپ و ئەوەندەی نەمابوو لەناو دوو بەرگا بڵاو بکرێنەوە. بەڵام باری ئەورۆژەی کوردستان و عێراق بوو بە کۆسپ لە رێی تەواو کردنی ئەو ئیشەدا و چاپخانەکەی کە تیا لە چاپ ئەدرا مۆر کرا و چی تیا بوو دەستی بەسەرا گیرا و کەس نەیزانی فۆرمە لە چاپ دراوەکانی دیوانەکە چۆن و لە کوێ فەوتێنران.

وا ئێستا سەر لە نوێ شیعرەکان کۆکرانەوە و هی زیاتریش دۆزرایەوە و هەمووی لە چاپ درا. هیوامان وایە ئەمجارە بە ئارەزووی دڵی هەموو نیشتمان پەروەران و ئەدەب پەروەرانی کورد بێ و پاشماوەی شاعیرەکانی تریشمان بەمجۆرە و جوانتر کۆ بکرێنەوە و لە چاپ بدرێن و ئەوانیش نەکەونە بەرپلاری چەرخی چەپگەرد.

مەبەستی ئێمە لە بڵاوکردنەوەی ئەم شیعرانە بەمجۆرە، هەر ئەوەندە بوو نەفەوتێن. ئەگینا شیعری "بێکەس" شایانی لێکۆڵینەوەیەکی وردە و پێویستی بەوەیە بە درێژی لەسەری بنووسرێ و ئەو دەورە روون بکرێتەوە کە "بێکەس" و شیعری "بێکەس" لە ژیانی نوێی نەتەوەی کورد و بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوە پەرستی و نیشتمان پەروەریدا گێڕاویانە. هیوامان وایە لە دوارۆژێکی نزیکدا هەلێکی باشمان بۆ هەڵ بکەوێ بۆ بەجێ گەیاندنی ئەم ئەرکە و بتوانین شتێکی وا بنووسین شایانی پایە و شوێنی "بێکەس" بێ لە مێژووی ئەدەبی نەتەوەکەماندا.

---

[١] لەم چاپی دووهەمەدا لە بارەی رێزمان و رێنووسەوە وردەیەك دەسکاری ئەم سەرەتایە کراوە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە ئەم شیعرانە تێکڕای شیعری "بێکەس" نین. "بێکەس" زۆر شیعری هەیە دەستی ئێمە نەکەوتووە. یا فەوتاوە یا لە نامەخانەی ئەم و ئەو دایە و بۆیان نەناردین. زیاد لەوە گەلێ شیعریشمان بلاو نەکردەوە چونکە بۆ ناو و ناتۆرە پیاهەڵدانی ئەو کەسانەی وتوە کە خراپەیان لەگەڵی کردووە. ئێمەش نەمانویست گای کۆن بە با بکەین و زامی پەترۆ بەستوو هەڵدەینەوە.... هەروەها سرورودی وایشمان لابوو کە دیار بوو بە نادروستی نووسرابووەوە و نارێکی تیابوو، بلاومان نەکردەوە بە هیوای ئەوەی لە پاشەڕۆژا بە بێ هەڵە دەسمان بکەوێ.

ئەمرۆش کەوا لە چاپ کردنی ئەم دیوانە ئەبینەوە. ئەبێ سوپاسی بنەماڵەی "بێکەس" بە هەموو ئەوانەدا بگەیەنین کە لە کۆکردنەوە و بەچاپ گەیاندنیا بەشداربوون بە تایبەتی بەڕێز کاك فەهمی قەفتان کە ئەرکی لە چاپ دانی گرتە ئەستۆ. مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبیحی کە نوسخەیەك لە دیوانەکەی لابوو پێی داین و برایان س.ع شادمان و عومەر مارف بەرزنجی لە سلێمانی و کەریم شارەزا لە هەولێر کە بە دەنگ بانگەوازەکانەمانەوە هاتن کە لە "برایەتی"دا بلاومان کردەوە و هەر یەکە چەند پارچە شیعری "بێکەس"یان لابوو بۆیان ناردین کە لای خۆمان نەبوو.

هیوامان وایە رەنجەکەمان بە دڵی خوێندەوارانی خۆشەویست بێ و لە کەم و کورتمان ببوورن و، هەزار سلاویش بۆ گیانی پاکی "بێکەس" شاعیری دەست و دەم پاك و بێگەردی کورد و کوردستان.

محەمەدی مەلا کەریم

## "بێکەس" لە چەند لاپەڕەیەکدا[1]

ناوی "فایق" و کوڕی "عەبدوللا بەگ"ی کوڕی "کاکە حەمە"ی کوڕی "ئەلیاسە قۆجە"یە. بنچینەی بنەماڵەیان لە قەڵاچوالانەوە هاتووەتە سلێمانی و خۆی لە ۱۹۰۵ دا لە سیتەك هاتووەتە دنیاوە کەدێیەکە بیست کیلۆمەترەیەك لە باکوری رۆژهەڵاتی سلێمانییەوە و ئەوسا مەرکەزی قەزای شارباژێڕ بووە. عەبدوللا بەگی باوکی لەوێ "تابوور ئاغاسی" بووە. لە دایکیشیەوە لە بنەماڵەی ئاغەلەرەکانی سلێمانی یە.

ساڵی یەکەم و دووهەمی تەمەنی لە سیتەك بەسەر بردووە و پاشان ماڵیان هاتووەتەوە سلێمان و لە تەمەنی سێ ساڵانا ئاوڵەی دەرداوە. هەر بە منالی باوکی لە حوجرەی فەقێ خستوویەتیە بەر خوێندن. لە ۱۹۱۱دا باوکی بە ئیشی میری نێرراوە بۆ خانەقی و لەوێوە بۆ بەغدا. لە بەغداوە ئەنێرێ بە دوای ماڵ و مناڵەکەیا و ئەیانباتە ئەوێ و پاش ساڵێك خۆی چووە بۆ تورکیا و ئەمانی لە بەغدا بەجێ هێشتووە. ئیتر فایق باوکی نەدیوەتەوە. هەر لەو ماوەیەدا حەمە سەعیدی برا گەورەی لە ئاوی دەجلەدا ئەخنکێ و دوا بەدوای ئەو دایکیشی کۆچی دوایی ئەکا و فایق ئەکەوێتە لای خاڵی. ئەویش پاش چەند مانگێك ئەمرێ و فایق و تاهیری برا بچووکی بە بێکەس ئەمێننەوە.

کە شەڕی یەکەمی جیهان دائەگیرسێ و رێی هاتوچۆی بەینی بەغدا و سلێمانی ئەبەسترێ، حاجی ئەمینی کاکە حەمەی مامی لە سلێمانییەوە ئەنێرێتە لای حاجی عەلی ئاغا کە لە بەغدا بووە، کە چاودێری فایق و براکەی بکا و هەر میراتێکیان لە

[1] ئەم کورتە مێژووە لە "مێژووی ئەدەبی کوردی" ی مامۆستا عەلائەدین سجادی و لە وتارێکی مامۆستا کەریم شارەزا کە لە ژمارە ۲۸ی پاشبەندی کوردی رۆژنامەی "العراق" "عێراق"دا بلاوی کردووتەوە و، لە بنەماڵەی شاعیر خۆی وەرگیراوە. ئەم باسە لەم چاپی دووهەمەدا دەسکاری کراوە و لێی زیاد کراوە.

باوك و دایكیانەوە بۆ مابێتەوە بۆیان خەرج بكا. ئەویش ئەیانداتە دەستی "حەبەخان" ناوێك كە خێزانی ئەفسەرێكی خەڵكی سلێمانی بووە لە بەغدا دانیشتووە... ژنەكەش مەردانە ئەیانخاتە ژێرباڵی بەزەیی خۆی و وردە وردە پێ یشیانی ئەخوێنێ. دوو سێ ساڵێك بەمجۆرە رائەبوێرن. لە ۱۹۱۷دا كەساسییەكی زۆریان تووش ئەبێ. لە ۱۹۱۸دا حەبەخان ئەیانباتەوە بۆ سلێمانی بۆ لای حاجی ئەمینی مامیان.

فایق لە سلێمانی ئەخرێتە قوتابخانە و لە پۆلی سێهەما وەرئەگیرێ و تا ساڵی ۱۹۲۳ بەردەوام ئەبێ لە خوێندندا و هەموو ساڵێ بە یەكەم دەرئەچێ. لەو ساڵەدا لەسەر ئارەزووی مامی ئەچێتە خوێندنخانەی "علمیە" لە كەركووك. بەڵام بۆی رێ ناكەوێ لەوێ بخوێنێ، ئەچێتە بەغدا و ساڵی ۱۹۲٤-۱۹۲٥ لە "دارالعلوم" بەسەر ئەبا. لەوێیش لەبەر دەم بزێوی ناتوانێ بژی و لە ۱۹۲٦-۱۹۲۷ دا ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی لەو كاتەدا سلێمانی تەنها پۆلی یەكەمی ناوەندی تیا بووە. ناچار تێی ئەچێ.

*لەو ساڵانەدا تەنگ و چەڵەمەی ژیان ناچاری ئەكا دوكانێكی جگەرەچییەتی بكاتەوە، بەڵام ئەمەش سەر ناگرێ , دەس ئەكا بە جگەرە و شقارتە فرۆشتنی دەسگێڕ و پاشان پەنا ئەباتە بەر "ئەشغاڵ" و بە رۆژانە لە رێگای عەربەت ئیش ئەكا و چەند مانگێك لەسەر ئەم ئیشە ئەبێ. لە ۱۹۲۸دا بۆ ماوەی چەند مانگێك لە هەولێر ژیاوە. لەو سەردەمەدا خوالێخۆش بوو "قالەی ئایشەخان" ئەندازیاری ئەشغاڵ بووە و سەرپەرشتی كردنەوەی رێگای هەولێر- رەواندز- رایاتی كردووە، بێكەسی دۆستی لە ئەشغاڵ دامەزراندووە. هەر لەو ساڵەدا بێكەس ئەبێ بە مامۆستای "زانستی" و لە ۱۹۲۹دا ئەبیسێ كە باوكی لە مەرعەش لە توركیا مردووە. لە ۱۹۳۰دا بە هەر دەردیسەرییەك بووە بە دوای میراتی باوكیا ئەچێ بۆ توركیا، هەر لەو ساڵەدا بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە.

*هەر لەو ساڵەدا بوو راپەڕینەكەی شەشی ئەیلوول لە دژی هەڵبژاردنە ساختەكەی دام و دەزگای پاشایەتی رووی دا. بێكەس یەكێك بوو لەو نیشتمان پەروەرانەی سەركردەیی ئەو راپەڕینەیان كرد و برینداریش بوو تیایا. لە ئەنجامی ئەو دەورەیدا ئەیگرن و ئەیخەنە بەندیخانەوە. شیعرە بە ناوبانگەكەی "ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم..."ی لەو بەندییەدا وتووە. هەر لەسەر ئەم بەشداربوون و سەركردەییەی لەسەر ئیشیش لای ئەبەن.

*كە لە بەندیخانە دێتە دەرەوە قوتابخانەیەك ئەكاتەوە بۆ ئەوەی دەرسی تیا بڵێتەوە و پێی بژی. لە ۱۹۳۳دا میری وەری ئەگرێ بە مامۆستا و ئەینێرێتە مۆرتكەی بازیان و پاشان ئەینێرێتە تەوێڵە. لە هاوینی ۱۹۳٥دا لەگەڵ كۆمەڵە مامۆستایەك كە یەكێكیان مامۆستا گۆرانی شاعیری بەناوبانگ بووە بەشداری لە دەورەیەكدا كردووە كە

له بەغدا بۆ مامۆستایان ئامادە كراوە. بێكەس لەو سەردەمەدا مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بازیان بووە.

*له ۱۹۲۷دا لە وزەی میری دا نامێنێ مامۆستایەكی نەترسی وا لە سلێمانیدا هەبێ گیانی خەبات و كوردایەتی بلاو بكاتەوە، دووری ئەخاتەوە بۆ حیللە و پاش ساڵێك ئەینێرێ بۆ عەمارە، بەلام بێكەس قایل نابێ بچێ و دەس لە ئیشەكەی هەڵ ئەگرێ و دێتەوە سلێمانی، قوتابخانەیەك ئەكاتەوە تا ۱۹٤۱ دەرسی تیا ئەڵێتەوە. ئەوجا ئەیكەنەوە بە مامۆستای قوتابخانەكانی میری و تا دوادوایی ساڵی ۱۹٤۸ لە قەرەداغ و سلێمانی و سوورداش و هەڵەبجە مامۆستا ئەبێ. له ۱۹٤۸/۱۲/۱۸ دا بۆ یەكجاری سەر ئەنێتەوە.

*بێكەس شاعیرێكی ئازا و نەبەز و چاونەترساو بووە. هەرگیز گوێیشی بە "پایە" و "شوێن" و دارایی نەداوە، تا ماوە بە سەربەرزی ژیاوە و لە رێگای دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتمان لای نەداوە و ژیان و شیعری خۆی بۆ خزمەتی ئەوان تەرخان كردووە. چەند جار ئینگلیزەكان ویستویانە بە تەمای پایەی "بەرز" لە خشتەی بەرن یان هەر هیچ نەبێ دەمكوتی بكەن. بەلام ئەو گوێی نەداونەتێ و بە هیچ نەخەڵەتاوە و لە هیچ نەترساوە. گرتن و دوورخستنەوە و لەسەر ئیش لابردن باوەڕی بە نەتەوە و ولاتەكەی لەق نەكردووە. نموونەیەكی هەرە دیاری ئەم چاونەترساوییەی بێكەس پارچە شیعری "بیست و حەوت ساڵە"یە كە لە ئاهەنگێكی مالاوایی دا، كە لە ساڵی ۱۹٤٦دا مەعروف جیاووكی موتەسەرریفی ئەو سەردەمەی سلێمانی، بۆ "ئەدمۆنس"ی راوێژ پێكراوی ئینگلیزی وەزارەتی ناوخۆی ساز كردبوو، رووبەرووی ئەدمۆنس خۆی و بەرابەر بە سەدان ك دس لە نوێنەرانی هەموو چینەكانی خەڵكی سلێمانی خوێندیەوە، لە كاتێكا كە ئەدمۆنس هەموو شتێ بوو لە عێراقا و ، كەم كەس ئەیوێرا قسەی عادەتی لە رووبا بكا......

*بێكەس وەنەبێ نیشتمان پەروەرێكی دوور و بێ ئاگا بووبێ لە هەڵسووڕانی رێكوپێكی سیاسی. بە گوێرەی ئەو لێكۆڵینەوانەی لەم رووەوە كراون لە جووڵانەوەی "ژ-ك" و دوا بە دوای ئەو لە دامەزرانی پارتی دیموكراتی كوردستان زۆر نزیك بووە. پارچە شیعری "داری ئازادی"یش كە دوابەدوای راپەرینەكەی ۱۹٤۸ی گەلی عێراق وتوویەتی و لەوانەیە دوا شیعریشی بێ، بەلگەیەكی بایەخداری نزیكییەتی لە بیروباوەڕی دیموكراتی.....

*بێكەس جگە لەزمانی كوردی، عەرەبی و فارسی و تا ڕادەیەك ئینگلیزیشی زانیوە. بە تایبەتی لە عەرەبیدا دەسێكی بالای بووە. هۆنراوەیەكی زۆری عەرەبی لەبەر بووە. وا بلاوە كە "معلقاتی سبعە"ی بە تەواوی لەبەر بووە.

★قسەی خۆش و نوکتە و گاڵتەوگەپی بێکەس لەناو کۆڕەکانی ئەو سەردەمەی سلێمانیدا باو بووە و ئێستاش ئەیگێڕنەوە. هەرگیز بۆ وەڵام دانەوە و قسەی بە تویکڵ دانەماوە.

★لەناو شاعیرانی کوردا ئەحمەد بەگی ساحێبقران "حەمدی" و لەناو نیشتمان پەروەرانی کوردستانا "مەحمود جەودەت"ی زۆر لا پایەبەرز بووە. جەودەتی شەهید یەکێك بووە لە دۆستە خۆشەویستەکانی.

★بێکەس دوو ژنی هێناوە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٢٥دا کە پاش ساڵێك بە دەردی سیل کۆچی دوایی کردووە و مردنەکەی کارێکی زۆری کردووەتە سەر دەروونی بێکەس و وای لێ کردووە ماوەیەك گۆشەگیر ببێ. لەم ژنەی کچێك و لە ژنی دووهەمی دوو کچ و کوڕێکی بووە کە "شێرکۆ"یە.

★وەکو• ئێستا دەرئەکەوێ بێکەس بە تەوژم "زەغت"ی خوێن مردووە. لەگەڵ ئەوەشا کە لە رۆژانێکی ساردی زستانێکی تووش و سەختدا مردووە. خەڵکێکی زۆر لەگەڵ تەرمەکەی لە هەڵەبجەوە هاتوونەتەوە بۆ سلێمانی و لەوێش خەڵکێکی زۆرتر لەگەڵی چوون بۆ گۆڕستان و لەنزیك گومەزی بابانەکانەوە، لە سەیوان، بەخاکی پاکی کوردستانیان سپاردووە.

★پاش مردنی بە چەند رۆژێك لەلایەن حکومەتی کۆنەپەرستی ئەو رۆژەوە فەرمانی لە ئیش دەرکردن و گرتنی دەرچووە!

★لە ساڵی ١٩٥٨دا ئاهەنگێکی گەورە بە بۆنەی یادی دەهەمی کۆچ کردنیەوە لە سلێمانی سازکرا.

# "بێکەس" وەك خەباتکارێك و وەك شاعیرێك[1]

سولەیمانی هەر لەسەرەتای دروست کردنیەوە لەسەر دەستی بابانەکانا، مژدەی جیانی نوێی بۆ کوردستان پێ بووە، کە کرایەوە بۆ ئەوە کرایەوە پێتەختی میرنشینیەکی کورد بێ، میرنشینی یەك هەر چەند بۆی نەلوا ببێ بەو میرنشینیەی میرنشینیەکانی تری کوردی لە دەرور خڕ ببنەوە و یەکیان بخا و قەوارەی دوارۆژی نیشتمانیان لێ پێك بێنێ، بەڵکو لە تاقی کردنەوەیەکی لەوە پاشیشدا هەر بۆی نەلوا هیچ نەبێ هەر خۆی بە تەنها وەك مەڵبەندی میرنشینیەك بمێنێتەوە، لە گەڵ سەری ترەوە لە بەشی باشوور و رۆژهەڵاتی نیشتمانەکەماندا بوو بە بناغە و چەکەرەی کوردستانی نوێ و هاوچەرخ.

کە چاوێك بەمێژووی رابوردوودا ئەگێڕینەوە، ئەبینین ئەدەبی نوێی زاراوەی کرمانجی خواروو بۆ یەکەمجار لەم شارەدا سەری هەڵدا و وردە وردە گۆی پێشبڕکەی لە ئەدەبی زاراوەی گۆرانی و کرمانجی ژووروو بردەوە..... ئەبینین ئەم شارە بوو هەر لە سەردەمی عوسمانیەکانا زۆرترین ژمارە خوێندەواری، لەچاو شارەکانی تری کوردستانی باشووردا، ناردە دانشگا و خوێندنگاکانی ئەستەموولێ.... ئەم شارە بوو لە کوردستانی باشووردا یەکەمین چاپخانەی تیا دامەزرا ویەکەمین رۆژنامەی کوردی تیا دەرچوو.... هەر لەم شارەوە بوو یەکەمین پێوەندی گەلی کورد بە سیستێمی سۆشیالیستی یەوە دەستی پێ کرد کە پاش شۆڕشی پیرۆزی ئۆکتۆبەر هاتە سەر رووی کار و ئەوە بوو شێخ مەحموودی نەمر نامە مێژووییەکەی لە ڕێگای شابەندەری رووسیای سۆڤیەتییەوە لە تەورێز بۆ لێنینی مەزن نووسی و هەر ئەم شارەش بوو "سۆن"ی نوماینەدەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز لە راپۆرتێکدا بۆ کاربەدەستانی سەرەوەی خۆی، گلەیی-

---

[1] ئەم باسە پۆختەی وتارێکە لە کۆڕێکی ئەدەبی یەکێتی نووسەرانی کورددا لە سولەیمانی لە ١٩٧٨/١٢/٢٩دا بە بۆنەی بیرەوەری٣٠ ساڵەی کۆچی دوایی بێکەسەوە خوێندمەوە م.م. ك.

بەداخـەوە  بڵاوبوونـەوەی ناووناوبـانگی بۆڵـشوێکی تێـدا ڕاگەیانـد.... لـە هـەمووش بایەخدارتر ئەم شارە بوو بوو بە مەڵبەندی یەکەمی بزوتنـەوەی سیاسـی و شۆڕشـگێڕی بەشی باشوور و ڕۆژهـەڵاتی وڵاتەکـەمان و تـا ئێـستاش ئـەم سـەربەرزییەی هـەر مـاوە و پایەدارە و لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژگاردا نازی پێوە ئەکات.

شاری پشتیرێکی مێژوویی و سیاسی وا دەوڵەمەندی هەبێ و ئەوەندە هاوچەرخ بێ و لەگەڵ پێویستییەکانی ژیانی نوێدا بەم چەشنە لێك ئاڵا بن، ئـەبێ هەمیشە مەڵبەنـدی سەرهەڵدانی بنووس و چاکەخوازی کەڵە کەڵەی وا بـێ نەتـەوە و وڵات شـانازییان پێـوە بکـەن و دەربـڕی ئـازار و ئاواتـەکانیان بـن و لەسـەر تـابلۆی نەخـشەی سەرانـسەری نیشتماندا وەك ئەستێرەی گەش و پرشنگدار ببریسکێتەوە.

ئەگەر پێش جەنگی یەکەمی جیهان سولەیمانی لەم مەیدانە پـڕ شانازی یـەدا شـاری تاقانەی کورد نەبووبێ و لە کوردستانی تورکیادا، بە تایبەتی گەڵێ شاری تـری وا بـووبن هاوبەشـی ئـەم شـان و شـکۆیەی بـووبن، خـۆ هـەموومان ئاگـادارین کـەوا لـە دوای ئـەو جەنگـەوە نەخـشەکە بـە جـارێ گـۆڕا. سـەرپان کردنـەوەی بزووتنـەوە میللییـەکانی کوردسـتانی بـاکوور و ڕۆژهـەڵات، هـەر چـەند شـان بـە شـانی سـەرپان کردنـەوەی حوکمدارێتی و پاشـان شۆڕشـەکانی شـێخ مـەحمودیش بـوو، بـەڵام شـاری سولەیمانی بـە پێچەوانەی ئەو بارە نابارەوە کە شارەکانی کوردستانی ئێـران و تورکیـا تێـی کـەوتبوون، درێژەی بە خەباتی خۆی دا و ئەگەر لە مەیدانی حوکمڕانیشدا کێشەکەی دۆڕاندبێ، لە مەیدانی سیاسەت و کۆڕ و کۆمەڵە پێکهێنان و بزووتنەوەی کولتووریدا بەردەوام بووە و درێـژەی بەخـەباتی خـۆی داوە و لـەم مەیدانـەدا دەسکەوتی مـەزنی وەدەسـت هێنـاوە و لاپـەڕەی زێـڕینی زۆری خـستووەتە سـەر مێـژووی خـەباتی سـەختی ئـەو وڵاتـەی. ئـەم ڕۆڵەی جگەرسۆز و شیرینیەتی.

پاش ژێرکەوتنی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و لە ئەنجامی ئەو هەموو کـەم و کـورتی و ناتەواوییانەدا کە لە دەزگاکانی شێخدا هەبوون و ڕۆشنبیرانی سەردەم هەمیشە باسیان ئـەکردن و هـەوڵی ڕاسـت کردنـەوەیان ئـەدان و لـە ئـەنجامی ئەوەشـەوە کـە تەزوویـەکی بێمتمانـەیی بـەوە کـە گـەلی کـورد شـایانی ئـەوە بـێ قـەوارەی خـۆی هـەبێ و ببـێ بـە خاوەنی دام و دەزگای تایبەتی خۆی بـە نـاو توێـژێکی فراوانـی خەڵکدا بـڵاو بـووەوە و داگیرکەریش لە لایەکەوە بە جۆرێك هانەهانەی ئەم تەزووی بێ متمانەییەی ئـەدا و لـە لایەکی کەشەوە بێ دەسکەوت نەبوو لەوەدا کە کەسانی هوشیار و ڕۆشـنبیر، لـە جیـاتی ڕێگای سیاسەت و خەباتی چەك بە دەستی، ڕێگای کولتوور و پێشخستنی گەل لـە ڕێگـای کولتـوورەوە بگرنەبـەر، چـونکە هـەر چـۆن بـێ ئـەو ڕێگایـە بـەش بـە حـاڵی پارێزگـاری

بەرژوەندی ئەو، لە ڕێگای خەباتی سیاسی و چەکدار کەم مەینەت تر بوو... لە ئەنجامی هەموو ئەم هۆیانەوە تەوژمێکی گەورەی ڕۆشنبیری وەچەی خوێندەواری خەڵکی سولەیمانی و دەورووپشتی گرتەوە و کۆمەڵێك شاعیر و بنووس پەیدا بوون لەم مەیدانەدا بە گەرمی تێ ئەکۆشان.

بەڵام زۆری پێ نەچوو ئەو سڕی و کاسییەی بەسەر خەڵکەکەدا هاتبوو ڕەوییەوە و بە هۆی دامەزرانی قەوارەی یەکگرتووی عێراق و پێوەندی بە یەکەوە کردنی کۆمەڵانی عەرەب و کورد و یەکتری ناسینی ڕۆشنبیران و سیاسەتکاران و تێکۆشەرانی هەر دوو لاوە، خەباتی خەڵکی بەغدا بە تایبەتی و ناوچە عەرەب نشینەکانی عێراق تێکرا لە دژی ئینگلیزی داگیرکەر و ئەو پەیمان و ڕێککەوتننامانەی ئەیویست بە سەر خەڵکیاندا بسەپێنێ، لە کوردستانیشدا دەنگی دایەوە و ئەوەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی گوژمێکی نوێیان بە خەڵکەکە دا و بە تایبەتی شاری سولەیمانی کە هەمیشە هەر پێش دەست و پێش قەرەوڵ بووە، بۆ وەبیرهێنانەوە و دەست خستنی مافەکانی گەلی کورد ڕێگای توندوتیژی گرتەوەبەر.

بێکەسی شاعیر یەکێك بوو لەو ڕۆشنبیرانەی ئەم تەوژمە نوێیە لە دەروونیا دەنگی دایەوە و بۆمبای یەکەمی لە وشە دروست کراو کە هەرگیز سارد بوونەوە و لە کار کەوتنی بۆ نییە، کە بێکەس لە خەباتی ئەو سەردەمەدا تەقاندییەوە و خۆیشی بە جەماوەر پێ ناساند، شیعرەکانی بوو کردنی بە چەکی دەستی و پێ یانەوە چووە شەڕی بەردەرکی سەرا و خەباتی پیرۆزی ڕۆژی ڕەش و گەشی شەشی ئەیلوولەوە و[1] تا مرد فرێی نەدا.

بێکەس شاعیرێکی زاتی نەبوو تا شیعر بۆ داخە تایبەتیەکانی خۆی تەرخان بکا. لای بێکەس شیعر و خەباتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بڵاوکردنەوەی گیانی شارستانیەتی نوێ، هەموو ئامێتەی یەك بوون و لە یەك جوێ ناکرێنەوە.

---

[1] لێرەدا شتێکی بچووك، بەڵام لام وایە بایەخدار، هەیە نابێ پشت گوێی بخەم، ئەویش ئەوەتە سەردتای هۆشیاری سیاسی فایق بێکەس لە ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی بەردەرکی سەرای سولەیمانییەوە نیشانەی لای ئێمە دیارە. بێکەس هەر چەند پێشتر شیعری وتووە و هەر چەند شاعیرێکی شارستانەتی خوازیش بووە، بەڵام نیشانەی زەقی دۆست و دوژمن نەناسینەوە و لێك جوێ نەکردنەوە لە پارچە شیعرێکیدا دیارە کە بە بۆنەی کردنەوەی یانەی فەرمانبەرانی هەولێردوە دایناوە و لە ژمارە (٥)ی ساڵی (٢)ی گۆڤاری "زاری کرمانجی" دا بڵاو کراوەتەوە کە لە ١١ی تەشرینی دووهەمی ١٩٢٨دا دەرچووە، بە پێچەوانەشەوە شیعری نیشتمان پەروەرانە و کوردانەی پێش ئەو ماوەیەمان لە بەردەستدا نییە دژی ئەم ڕایەمان بگەیەنێ، هەر چەند هەندێ شیعری کۆمەڵایەتی سیاسی هەیە.

بێکەس تەنانەت وەك گۆرانی تا سەرەتای ساڵەکانی پەنجاش نییە کە هەر عەودالی دوای جوانی و سروشت و هونەر بۆ هونەر بووبێ و ئەگەر جاروبار شتێکی تایبەتی وەك تابلۆیەکی شەڕی بەردەکی سەرا، یا وەك خنکاندنی مەحمود جەودەت، یا وەك پاشکەوتوویی لە رادەبەدەری کوردستان بە بەراورد لەگەڵ جوانی سروشتی و ئاواتی دوارۆژی گۆران خۆی پێی، یا وەك مەترسی فاشیزم یا دیمەنی سامناکی یەکێ لە کولۆلییەکانی مرۆڤایەتی لە وڵاتێکی وەك وڵاتی خۆماندا، تەکانێکی توندی پێ نەدا بێ و نەیهەژاندبێ، شیعری لەو چوارچێوەیە دەرنەچووە کە وتمان، کە راستەکەشی ئەگەر ناچاری ئەرکی تر نەخاتە ئەستۆی شیعر، ئەرکی هەر ئەوەیە گۆران لەو سەردەمەدا تەرخانی کردبوو بۆی. وەك پیرەمێردیش نییە کە لە خولگەی پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و بە تووێکڵ و حیکمەتی کۆمەڵایەتیدا بسووڕێتەوە و ئەگەر جاروباریش رووداوێك پێویستی کرد خۆی بخاتە کۆڕی سیاسەتیشەوە و گوڵێ بە سنگی خەباتی گەلدا بکا. وەك کەسێکی لە چەشنی مەلای کۆیەش نییە شۆڕشگێڕییەتییەکەی تەنها لە دژی دیمەنەکانی پاشکەوتنی کۆمەڵایەتی بخاتە کارو هەقی بە سەر بنەمای پاشکەوتنەکەوە نەبێ کە باری سیاسییە.

بێکەس شاعیرێکە شیعر چەکی دەستی بووە لە خەباتدا. جا بۆیە ئەگەر سادەیی و رەوانی و بێ وێنەیەکی زەقمان تێکرا لە شیعری بێکەس دا بێتە بەرچاو، نابێ گلەیی لە بێکەس خۆی بکەین بۆ وا شیعری لە خاسیەتە بنەڕەتییەکانی داماڵیوە؟ رووی دەمی گلەیی ئەبێ بکرێتە ئەو بار و چەرخە ستەمکارە کە بێکەسی ناچار کردووە لە پێناوی وریا کردنەوەی گەلدا واز لە گەلێ رووی هونەری شیعر بێنێ و شیعری سادە و سووك و ئاسان دارێژێ تا خەڵکی پێ وشیار کاتەوە. بەختی بێکەس لەمەدا لەوە ئەچێ وێنەکێشێکی بەناوبانگ ناچاری ئەوە ببێ دەرسی ئەلف و بێ بە منالان بڵێ. بێ گومان ئەرکی ئەلف و بێ وتنەوە بە منالان ئەرکێکی ئێجگار پیرۆزە، بەڵام دیارە لە بارەی شارستانەتییەوە بۆشایی ئەوە پڕ ناکاتەوە کە هونەرمەندێکی باڵای وێنەکێشمان لە دەست بچێ. ئەگەر کۆمەڵەی ئەو هونەرمەندە وێنەکێشە، کۆمەڵەیەکی بەختەوەر بوایە لەسەر مامۆستای ئەلف و بێ وتنەوە پەکی نەئەکەوت و ئەمیش بۆی ئەلوا خۆی بۆ هونەرەکەی خۆی تەرخان بکات و وێنەی جوان بۆ ئەم خەڵکە و بۆ دەوڵەمەند کردنی جیهانی هونەر بکێشێ. بێکەسی ئێمەش هەروا ئەگەر باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری دواکەوتووی کورد ناچاری نەکردایە شیعرەکانی بۆ چارکردنی ئەم دەردانە تەرخان بکات، لەوانە بوو ئەویش وەك گۆران، یا چەردەیەك لەو ئایەختر، دەیان پارچە

شیعری ناسکی وەك ئەوانەی پێش بە ناخی سیاسەتا- چوونە خواری گۆران، وەك "ئەی مانگ"ەکەی خۆی بڵێ.

لە کوردستان و وڵاتە پاشکەوتووەکانی وەك کوردستاندا، باری پاشکەوتووی کۆمەڵ ئەرکی ئەوتۆی خستووەتە سەرشانی شیعر، خەڵکەکەش وایان لێ هاتووە وا ئەزانن لە راستیدا شیعر بۆ بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکانە داهاتووە، کەواش نییە. ئەگەر کۆمەڵ بە رۆژی بەختەوەری خۆی گەیشتبوایە، شیعر کە بۆ ئەوە دانراوە یەکێکی وەك مەولەوی بیڵێ کە ئەزانێ چۆنی ئەڵێ، بۆ بابەتی وا بوترێ کە هەرگیزاو هەرگیز مردن بە خۆیەوە نەبینێ، لە هەموو کاسەیەکدا نەئەبوو بە کەوچك و لە هەموو دیزەیەکدا نەئەبوو بە ئەسکوێ..... مەلای مزگەوت نەی ئەکرد بە هۆی فێرە تارەت گرتن و دەس نوێژ شتن و نوێژ کردنی خەڵکی نەخوێندەوار و منداڵی قوتابخانە.... خاوەنی "ئەحمەدی" و خاوەن ئەحمەدییەکانی تر نەیان ئەکرد بە فەرهەنگ بۆ زمانی بێگانە بە منالاّن فێر کردن.... سیاسییەکان نەیان ئەکرد بە چەکی وروژاندنی خەڵك بۆ خەبات لە دژی داگیرکەران و خوێن مژان. رۆژنامەنووسە شۆڕشگێڕەکان جێگای سەروتاری رۆژنامە و گۆڤارەکانیان پێ رەش نەئەکردەوە... رەشە خەڵکەکەش نەئەهاتن تاقی کردنەوەی کۆمەلایەتی خۆیانی پێ دارێژن.... ئەمە هیچی لە بنەڕەتا ئەرکی سەرشانی شیعر نییە گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی یا خستوویانەتە ئەستۆی. بەلاّم وەك ئەڵێن "ڕووی نەبوونی رەش بێ" ناچاری حەرام حەلاڵ ئەکا و شتێك نییە کەس لە ئاستیا بتوانێ بڵێ "لەل"..... بۆیە ئەگەر لای ئێمەش، وەك لای هەر گەلێکی وەك ئێمە، لە رێگای شیعرەوە دەرسی ئایین بە منالاّن بڵێن و "شێخ مارف نۆدێ" بە شیعر "کاك ئەحمەد"ی کوڕی فێرە عەرەبی بکا و "حاجی قادری کۆیی" کۆمەلانی دواکەوتووی کوردستان بە شیعر وشیار بکاتەوە و مژدەی جیهانی نوێی پێ بێنێتە ولاّت و "پیرەمێرد" قسەی ئەستەق و تەجرەبەکانی ژیانی کۆمەڵ بە شیعر بهۆنێتەوە و "قانیع" بە شیعر جووتیاران لە خەوی بێ ئاگایی راست بکاتەوە و لە دژی دەرەبەگی خەرمان تالاّن کەر و شێخی مفتەخۆر و مەلای دەس بڕ و بازرگانی بە سوود و سەلەم سەوزخڕیان بووروژێنێ، دیارە ئەبێ "بێکەس" و بێکەسەکانی تریش هەر وا بکەن و بیکەن بە چەکی خەبات و پرۆگرامی سیاسی و راست کەرەوەی باری کۆمەلایەتی و ئاوێنەی دەربڕینی داخوازییە کۆمەلایەتییەکان و بەڵکو ئەگەر وا نەکەن، لە ئاستی گەل و نیشتمانەکەیاندا بە کەمتەرخەم و درێغی کردوو دائەنرێن و راستیشە ئەبێ وا بن. شیعری کوردی کە لەبەر ناچاری هێنرایە ئەم مەیدانانەوە، پیاوانە لە هەقی ئەم ئەرکە

تازەیەش هات و تا سەردەمێکی درەنگی لەمەولاش ئەم دەورە هەر ئەبینێ و هەڵە و تاوانە بمانەوێ ئەکتەری ئەم شانۆنامەیەی لێ بسەنینەوە.

بۆیە ئەگەر شیعر لەم مەیدانەدا لە سەرجادە و لە ناو پۆلی قوتابخانە و لە دەرگای مزگەوتەکان و گەڕەکەکانی هەژاراندا تۆزاوی و خۆڵاوی و قوڕاوی بوو، جارجار شیعرێکی کاڵ و کرچ یا لار و وێر یا سادە و بێوێنەی لێ دەرچوو، گلەیی لە شاعیر ناکرێ و شاعیر بەرابەر بە هونەر بە تاوانبار دانانرێ.... خزمەتی خەڵکی کردووە کە لە پێش هەموو ئەرکێکەوەیە تەنانەت بە پاراستنی نازداری هونەریشەوە. ئێمە ئەگەر بمانەوێ شیعرمان لە ناسکی پەڕەی گوڵ و پاراوی رەشە رێحانە و جوانی ساقی وەنەوشە و دەم بە خەندەیی چاوی نێرگسدا بێ..... کچێکی شۆخی چاوڕەشی قژدرێژ و شانەکراوی شەپۆل بەسەر شانا هاتووە خوار بێ، ئەگەر بمانەوێ شیعرمان خۆراکی گیان بێ و هەمیشە هەر نەمر بێ، ئەبێ تێ بکۆشین کۆمەڵەکەمان بگەیەنینە ئەو ئاستە بۆ هەر کارێکی هۆی تایبەتی خۆی بەکار بێت. جا بەش بە حاڵی شیعریش، کە کۆڕ و کۆمەڵەی سیاسی و دەربڕی ئاواتی خەڵکمان بە ئازادی هەبوو، کە رۆژنامە و گۆڤاری سیاسیمان بە فراوانی و مشەمەری پێدەرکرا و هەموو خواست و داخوازییەکی خەڵکیان تیا بە کاڵا کرایەوە... ئەگەر توانیمان بێ ترس و لەرز رەخنە بگرین و پێویستمان بە شیعری رەمزی نەما بۆ رەخنەگرتن، کە کۆبوونەوە و کۆڕ بەستن بەرەڵڵا بوو، وتاری بێ پێچ و پەنای تیا خوێنرایەوە، ئەو کاتە پێویستمان بەوە نامێنێ بۆ دەربڕینی داخوازییەکانمان پەنا بەرینە بەر بەکارهێنانی توندوتیژی و پێویستمان بەوەش نامێنێ تووڕەیی خەڵك بوورووژێنین و سەرەوژێری ناو شەقامەکانیان بکەینەوە. ئەو کاتە شیعریش ئەو مەیدانانە بەجێ دێڵێ کە لە بنەڕەتدا هی ئەو نین... ئەچێتەوە ناو باغچە و گوڵزاری خۆی و لە پشت پەردەی ناسك و پەنجەرەی شووشەبەندی رەنگاوڕەنگدا دائەنیشێتەوە چاوە تاتکێ لەگەڵ دڵدارەکانی ئەکا...شیعرمان ئەبێ بە شیعرێکی تر، غەیری ئەوەی ئێستا زۆربەی ناوچەی شیعری داگرتووە...لە ناسکی شیعری مەولەوی و بێسارانی و کوردی و گۆران و هەردی و هەموو شاعیرە هونەرمەندەکانی ترمانا ئەبێ و مەسەلەی پێوەندی نێوان کاری هونەری و خزمەتی کاروباری رۆژانەی کۆمەڵ ئەکەوێتە ناو چوارچێوەی راستەقینەی خۆیەوە.

بێکەس تێکۆشەرە بەر لەوەی شتێکی تر بێ. تێکۆشەری سیاسییە. تێکۆشەری کۆمەڵایەتییە. مامۆستای منالانیشە. شاعیریشە، بەڵام ئەو تێکۆشەرە نییە کە بۆ راگەیاندنی بیر و باوەڕی خۆی پەنا بەر کۆڕ و کۆمەڵە و شان و رۆژنامە و بەیاننامە بەرێ. چەکی دەستی هەموو هەر شیعرەکانی و هاوجووتی گوفتار و کرداریەتی. ئەو

مامۆستایەش نییە میری کتێبی بۆ دابنێ و ئەویش ئەویە لەسەر بێ بۆ منالانی لێك بداتەوە. دیارە نابێ دەس بەرداری کتێبەکانی میری ببێ، بەلام خۆیشی بابەتێکی هەیە بە منالی بلێ. کتێبی ئەم بابەتانەیشی شیعرەکانیەتی، چ شیعری منالان و چ سروودی سیاسی.

بێکەس شاعیرێکی نەتەوەپەرستە، وەك بنووسێك[1] لە یادی دە سالەی کۆچ کردنیدا نووسیویەتی دوای حاجی قادری کۆیی یەکەم هەلگری ئالای کوردایەتی و نەتەوەپەرستییە. وەك مامۆستا رەفیق حیلمی یش ئەیگێرێتەوە[2] رەخنەنووسێکی ئەدەبی فەرەنسەیی لە ریزی شاعیرە قەومییە تازەکانی کوردا ئەیژمێرێ. من لام وایە ئەم رەخنەنووسە هەقی تەوانی بێکەسی نەداوەتە دەست. بەلام کەس وای بۆ نەچێ من کە وتم بێکەس شاعیرێکی نەتەوەپەرستە، مەبەستم ئەو مەعنا سادە و کال و کرچەیە لە ئەدەبیاتی سیاسیدا نەتەوەپەرستی پێ مەعنا لێ ئەدەنەوە. جارێ لە هیچ شیعرێکی بێکەس دا هیچ جۆرە گیانێکی نەتەوەپەرستی شێت گیرانە و بە کەم زانینی نەتەوەکانی تر بەرچاو ناکەوێ، هەر چەند ئەو بارە سیاسی و کولتورییەش کە تیا ژیاوە رێگای ئەوەی بۆ تەخت نەکردووە لە مەعنای پێشکەوتخوازانەی نەتەوەپەرستی بگات و رێگاکانی بەر پێی بەجۆرە شۆڤێنیەتێکی نەگەیەنن.

بێکەس کە لەگەل راپەرینی بە گوژمی جەماوەری رۆژی رەشی شەشی ئەیلوول و شەری بەردەرکی سەرادا، بۆ یەکەمجار ئەتەقێتەوە کە شەرێك بووە بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و دەولەتی ناوخۆی دەس نیشاندەی بە دلێکی وەك بورکانەوە دێتە کۆری خەبات و خەلك هان ئەدا. بەداخەوە هیچ شیعرێکی ئەودەمەی بێکەسمان بە دەستەوە نییە کە لەو رۆژەدا لەناو کۆری جەماوەرا خوێندبێتیەوە و ئاگری پێ بەردا بێتە دل و دەروونیان. بەلام دیارە ئەبێ شیعری وای بووبێ. ئەگینا شاعیرێ کە لە پاش گرتنی بە بۆنەی ئەو راپەرینەوە لەناو قوولایی بەندیخانەدا شیعری وەك "ئەی وەتەن"ەکەی بلێ، بە دلا ناچێ لەو رۆژەشدا چەند پارچەی ئاگرینی نەوتبێ.

بێکەس لە بنی چالی رەشەوە راپەرینی خەلك بە مژدەی بەختەوەری دوارۆژی گەل دائەنێ. راستە وایە، چونکە بەختەوەری هەر لە تێکۆشان و کولۆلی هەر لە سەرشۆریدایە. مادەمیش خەلك هاتوونەتە کۆری خەباتەوە و سەردەمی کر و کپی یان

---

[1] بروانە وتاری "بێکەس شاعیری خەباتکەر" کە لە ژمارە ١٤٢٣ی رۆژنامەی "ژین"دا بلاو کراوەتەوە کە لە ١٩٥٨/١٢/١٨دا دەرچووە.

[2] بروانە لاپەرە ٦٣ی بەرگی یەکەمی "شیعر و ئەدەبیاتی کوردی"ی مامۆستا رەفیق حیلمی کە لە سالی ١٩٤١دا لە چاپخانەی "تفیض" لە بەغدا لە چاپ دراوە.

ناوەتە لاوە، دیارە ئیتر نۆبەی شادمانییە بۆ بێکەس و ئەبێ دوژمن بە داخی خەباتی خەڵکەوە بتلێتەوە. بەرپەرچی ئەو بە دەم نیشتمان پەروەرانەش ئەداتەوە کە لە قسە بەولاوە هیچیان لە باران نییە و بەراوردیان لەگەڵ ئەوانە ئەکا کە لە خوێنی خۆیانا ئەتلێنەوە کە دوژمن گلاندوونی و پەیمانی خۆی تازە ئەکاتەوە بۆ گەل و نیشتمانەکەی کە هەر رۆڵەکەی جارانیان بێ و دیارە ئەو پەیمانەشی مەردانە بردە سەر و تا مرد نەیشکاند.

بێکەس ئەڵێ:

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
وەختی بەندی ییو ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم، وا تێ نەگەی
حەپس و تێ هەڵدانی و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە
بەو خودایەی بێ شەریك و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت گڕ و کڵپە و بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونی و کەساسی خۆت نەکەی توخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینی تا بە کەی، دەی پێکەنە و سەر هەڵبڕە
موفتەخیر بە، شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە
نەگبەتی لاچوو، سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە، ئەدرەوشێتەوە
گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لێك بێتەوە
لاف میللییەت بە دەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییە
رۆژی هەوڵە، هەر بە هیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێقوسوورە، چەند جەسوورە سەد شوکر ئەولادەکەت
وا لە رێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە

بەسیە، تەعنەم لێ مەدە، هەر رۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

کە خەباتی گەلیش لە قۆناغێکدا تێك ئەشکێ و ئەو یەکێتییەی کە پێشتر لێشاوی گیانی شۆڕشگێڕی گەل لەناو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵدا دروستی کردبوو، ئەپسێ و چینە سوودپەرستەکان پەردە لە رووی خۆیان دائەماڵن و بێ ئەوەی شەرم و شکۆیەکیان لە روودا بمێنێ، ئەچن پاکانە بۆ دوژمنی خوێن خۆری گەلەکەیان ئەکەن و جێکی نۆکەرایەتی خۆیانی بە هەر دە پەنجە بۆ مۆر ئەکەن و تەنها ئەوانە لە کۆڕی خەباتا ئەمێننەوە کە شتێکی ئەوتۆ شك نابەن بە داگیرکەران و نۆکەرانی داگیرکەریانەوە ببەستێ و پیرەمێردی نەمر بە پارچە شیعری "وەفدی کوردستان"ەکەی بەرەو باشوور بەڕێیان ئەکا و داخی رووزەردی و نەنگ و عار بە ناوچاوانیانەوە ئەنێ، بێکەسیش بەسەر پارچە شیعرەکەی پیرەمێرددا دێتەوە و ئەیکا بە پێنج خشتەکی.

کە بنیادەم ئەم پێنج خشتەکییە ئەخوێنێتەوە، هەست ئەکات چۆن بێکەسی نیشتمان پەروەری دڵسۆز، هەر وەك بڵێسەی ئاگر، بە رووی ئەو خۆفرۆش و بێ میللەت و بێ نیشتمانانەدا بەرز ئەبێتەوە کە هەموو مەبەستێکیان لە ژیانا هەر ئەوەیە هەڵپەی سوودی تایبەتی خۆیانیان بێ و بازرگانی بەخوێنی هەزران سەربازی نەناسراوی رێگای خەباتەوە بکەن کە لە پێناوی ئازادی نیشتمان و بەختەوەری گەلدا خوێنی خۆیان ئەکەنە سەر لەپی دەستیان، ئەو خۆفرۆشانەی کە قوربانی دانی تێکۆشەران ئەکەن بە پێ پیلکە بۆ خۆیان تا بەسەر لاشەی قوربانییەکانی نەتەوەدا بڕۆن و بگەنە ئەو پایە و شوێنە دنیاییە سووکەی ئەیانەوێ و هەرچی بیر و باوەڕ ئامانجی پیرۆز و داوای دوێنێیان هەبووە، هەمووی ئەخەنە لاوە.

بێکەس ئەڵێ:

قـــەدری میللـــەتتان بـــە جـــاریٚ شـــکان
نـــە حـــەیاتان مـــا، نـــە ناوونیـــشان
بـــاری تەعنـــەتان وا هاتـــە سەرشـــان
"وەفـدی کوردسـتان! میللـەت فرۆشـان!"
"هـــەرزە وەکیلـــی شـــاری خامۆشـــان!"

بێکەس واتای شیعرەکانی پیرەمێرد لە چوارچێوە کەم دەرەتانەکەی ئەکاتە دەرەوە و وەك هـەر شۆڕشـگێڕێکی راسـتەقینە کـە بزانـێ چـینە خـوێن مـژەکان هەرچـی لاف نیشتمانپەروەری لێ بدەن لە راستیدا بۆ ئەوەی لێ ئەدەن رێگا بۆ دەس خستنی سوودی تایبەتی خۆیان خۆش بکەن، دێ ناوەڕۆکی چینایەتی خەباتی نەتەوەییمان بۆ دەرئـەخا و لە دەلاقەی شیعرەوە ئەو راستییەمان ئەخاتە بەرچاو کە مارکسیزم و لێنینزم زووتـر دەری خستووە، ئەوەش ئەوەتە کـە بـۆرژوا لـە بـازارەوە فێـری نیـشتمانپەروەری ئـەبێ و دیارە هەر بە هۆی بازاڕیشەوە لە بیری ئەچێتەوە:

حـــاجی! تووتنەکـــەت مـــادەم فرۆشـــرا
ڤیروســـیا لـــە ســـەد کوشـــتن و هـــەرا
دەخیلـــە هەســـتە، رێکـــەوە، خێـــرا
"دەسـکێ لـەو گوڵـەی باغەکـەی سـەرا"
"کـــەوا بـــە خـــوێنی لاوان ئـــاودرا"
تاقمـــێ رێـــك خـــەن زۆر بـــە پڕلاقـــی
بـــە بـــەزم و رەزم و ئاهـــەنگ و ســـاقی
بـــۆ ئـــەوەی بکـــەن دەفعـــی مـــەراقی
"بیبەنـــە بـــەردەم عەرشـــی عێراقـــی"
"بڵێن یـار بـاقی و هـەم صوحبەت بـاقی"

ئەنجا بە تەوسەوە بە شێوەی تانە و تەشەر، ئەوەی لە دڵی ئەو خۆفرۆشتووانەدا هەیە کە ئەگەر بیانوێرایە بە خەڵکەکەیان ئەوت، بۆمانی دەرئەخا و ئەڵێ:

نــــە بارانتـــان دی، نـــە بـــا، ئـــەی فـــەقیر
نـــە لاوان کـــوژران بـــە گوللـــە و شەســـتیر
نـــــە پێــــی نـــازداران خرایــــە زنجــــیر
"پـــەردە و تـــارای ســـوور بـــەرن بـــۆ ئـــەمیر"
"بڵـــێن دوای کوشـــتار هێـــشتا تـــۆی دلگـــیر"

جا بە زوبانی خۆی و خەڵکەوە دەنگ و هاواری ناڕەزایی هەڵ ئەبڕێ و ئەڵێ:

هـــــاوار بــــە مـــاڵم چـــیمان پـــێ کـــــرا
لـــــە چـــــارەکێکا ســـــەدمان لـــــێ خـــــرا
هێــــشتا خــــەڵاتیان ئەکـــەن بـــە بـــەرا
"دەك خەجاڵـــەت بـــن لـــە رۆی مەحـــشەرا"
"ئێمـــە خـــاك و خـــوێن ئەکـــەین بـــە ســـەرا"
"ئێوەش ئەو عەرشەی بە خـوێن گوڵ رەنگـە"
"ســـوجدەی بـــۆ ئەبـــەن هـــیچ نـــاڵێن نەنگـــە"

بەڵام لەگەڵ ئەو ئەنجامە ناخۆشەش کە بەزینی راپەڕینەکە و خۆفرۆشتنی کۆمەڵێ لە سەرکردەکانی، لە دڵی جەماوەردا بەجێی هێشتبوو، بە تایبەتی لەو رووەدا کە هوشیاری سیاسی هێشتا زۆر کز بوو، خەڵك لەوە نەئەگەیشتن کە تێکۆشانی سیاسی رەنگدانەوەی سوودە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵە و میللەت وەنەبێ بریتی بێ لە تاقمێ سەرکردە و لە توێژەکانی سەرەوەی کۆڕ و کۆمەڵە دەم هەراش و قسەزانەکان و شارەزاکانی کاروباری دنیا، تا ئەگەر ئەمانە خۆیان فرۆشت ئیتر هەموو شت ببڕێتەوە، بەڵکو میللەت ئەم جەماوەرە بێ شومارە رەش و رووتەیە کە سوودی هەرگیز لەگەڵ سوودی داگیرکەران یەك ناگرێتەوە و قەت ناتوانن لەگەڵ یەك ئاشت ببنەوە. هەروەها لەگەڵ ئەوەش کە دوژمن بە هەموو هێز و توانای، وەك هەمیشە هەر

وا ئەکا، هەوڵی ئەدا گیانی وەربەردان و بێ باوەڕی و نائومێدی لەناو رەشە خەڵکەکەدا بلاو بکاتەوە کە هێزی سەرەکی خەباتن...بەڵێ لەگەڵ هەموو ئەوەش و بە پێچەوانەی هەموو ئەوەشەوە، بێکەس راست ئەبێتەوە دارێك ئەدا بە لووتی ئەوانەدا کە دڵی خۆیان خۆش ئەکرد گوایە ئیتر راپەڕینی میللەت بڕایەوە و تێکۆشان بەزی و جگە لە سەر شۆڕ کردن بۆ داگیرکەر و مل بۆ کەچ کردنی هیچ شتێکی تر لە ئارادا نەماوە. گوێ راگرن بۆ بێکەسی نەبەز، بۆ بێکەسی دڵ بە باوەڕ ئاوەدان، بۆ بێکەسی بەرچاو روون کە ئەڵێ:

قــــەت وا تێمەگـــــەن چـــــاومان شـــــکاوە
کوشــــتن و بــــڕین دائـــــیم بــــۆ پیـــــاوە
لــــەناو دۆشـــــەکا کــــەی حــــەق ســــەنراوە
"خــــەیاڵتان خــــاوە کــــورد نەفــــەوتاوە"
"بــــەراتی نــــەجات بــــە خــــوێن نووســــراوە"

میللــــەت مەتینــــــە عــــەزمی نانــــــەوێ
لــــە غایــــەی بــــەرزی خــــۆی هــــەر ناکــــەوێ
لەتوپــــــەت کــــــرێ حوقــــووقی ئــــــەوێ
"مــن رەنگــی ســوورم بۆیــە خــۆش ئــەوێ"
"مــــژدەی شــــەفەقی لــــێ دەرئەکــــەوێ"

لەم قۆناغە بەدواوە لەناو چینەکانی کۆمەڵەی کورددا رێزبەندییەکی نوێ لە رووی کۆمەلایەتییەوە دەست ئەکا بە پەیدا بوون. ماوەیەك دنیاکە چەشنە ئارامییەك ئەیگرێتەوە. ئەوە ماوەی ئاوس بوونی کۆمەڵەی عێراق و کوردەواریشە بەو رووداوانەی لەوەلا دەستیان بە سەر هەڵبڕین کرد کە مێژووی ساڵەکانی سی پڕ ئەکەنەوە. هەر لەم ماوەیەدا بێکەسیش ئەکرێ بەمامۆستا و لە شار دوور ئەخرێتەوە، بەلام ئەو هەر لە تێکۆشانی خۆی ناکەوێ. هەر چەند لەو جەماوەرەشەوە دوور ئەبێ کە کاروباری نەتەوەیی بیبزوێنێ، لە رێگای دەرسی قوتابخانەوە کە بە قوتابییەکانی ئەڵێتەوە، تۆوی شۆڕش لە دڵی وەچەی نوێدا دائەچێنێ. سروود و شیعری نیشتمان پەروەرەییان بۆ ئەڵێ و پێیان لەبەر ئەکا. خەباتیش لە پێناوی خوێندەواریدا و لە دژی بیروباوەڕی

کۆنی ڕزیو کە باڵی بە تایبەتی بەسەر لادێکاندا کێشابوو، مەیدانێکی گەورەی خەباتی ئەم ساڵانەی بێکەسە. میری بێکەسی بۆیە ناردبووە لادێ چونکە لە شارا بۆی قووت نەئەچوو. دیتی لە لادێیش هەر سەربزێوەکەی جارانە. ئەینێرێ بۆ حیللە، بۆ ئەوەی کەس نەبێ قسەی بۆ بکا، بەڵام چۆن کەس نییە؟ لە حیللەش هەر میللەتێکی دەس بەسەرو ستەمدیدە و چەوساوە بووە، با بە زمانێکی کەش بدوێ بۆیە لە سەرەتای ۱۹۳۷دا لەسەر کاری لائەبەن. بێکەس لەم ساڵەوە تا ساڵی ۱۹٤۱ واتە تا ڕاپەڕینەکەی عێراق لە دژی ئینگلیز دوور لە قوتابخانە و قوتابییان ئەبێ، بەڵام لە ۱۹٤۱ دا ئەخرێتەوە سەر کار و ئەنێررێتەوە بۆ لادێ.

جووڵانەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی لەم ماوەیەدا هەر لە پتەوکردنی جێ پێی خۆیدا ئەبێ. جووڵانەوەی ڕێك‌وپێکی چینایەتیشی دێتە پاڵ. ڕۆشنبیرانی تازە پێ گەیشتوو کۆڕ و کۆمەڵە و ڕێکخراوی نوێ پێکەوە ئەنێن.... دەنگی خەباتی گەلەکەی خۆیان لەگەڵ خەباتی عەرەب یەك ئەخەن.... ئەنووسن... گۆڤار و نامیلکە بڵاو ئەکەنەوە.... بەڵام بێکەسی لادێ نشین لێیانەوە دوورە و دەنگێکی کپیان نەبێ بە یەکتری ناگا.

شەڕ ئەبڕێتەوە..... فاشیزم فڕێ ئەدرێتە سەر سەلوێنکی مێژوو.... جیهانی سۆشیالیزم تەوقی دەوری خۆی ئەشکێنێ و تیشکی ڕۆژی خۆی ئاراستەی سەروچاوی هەموو جیهان ئەکا.... عالەم هەموو بە هیوای جیهانێکی نوێ ئاواتی کۆن لە دڵ و دەروونیدا تازە ئەکاتەوە... مقۆ مقۆ پەیدا ئەبێتەوە کە ئەمجار وەك پاش جەنگی یەکەم نابێ و جارێکی تریش کورد بەگورگان خوارد نادرێ و شتێکی چنگ ئەکەوێ. بەڵام بێکەس، نازانم لە هوشیاری و تێگەیشتنی سەنگ و ترازووی هێزەکانی جیهانەوە بووە یا هەر لە ناهومێدییەکی پاشماوەی ناهومێدییەکانی پێشەوە، باوەڕی بەم قسانە هیچی نییە. ئەو لای وایە هەرچی ئەوتری هەمووی هیچ و پووچە و ماف هەرگیز نەدراوە، ستێنراوە، گەلیش کە نەزان و نەخوێندەوار بوو و چاکە و خراپەی خۆی نەزانی هەر ئەوەی بە نسیب ئەبێ کە دیلی بێگانە بێ:

دەنگ بڵاوە و خەڵق ئەڵێن ئەمجارە کورد سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بیڵێن، لەلام وایە درۆ و چاوبەست ئەبێ
سەد هەزار جارمان سیاسەت تەجروبە کرد و کەچی
ئێستەکەش زۆرمان بە فیشاڵی وەها سەرمەست ئەبێ

کەی حوقووق ئـەدرێ؟ ئەسـەنرێ. عەیبـە ئـیتر تێبگـەن
سـەربەخۆیی چـۆن نـسیبی قـەومی وا بێدەسـت ئـەبێ
میللـەتی جاهیـل لـە دنیـادا ئـەبێ هـەر بەنـدە بـێ
نۆکەری هەر خشت بەبالای قـەومی دیـل و پەسـت ئـەبێ

لەگەڵ هەندێ سەری نیوە و ناتەواو راستی بیری ئەم شیعرەشدا، لە سەرێکی کەشەوە بـۆنێکی خەسـتی نائۆمێدیـشی لـێ ئـەکرێ. راسـتەکەی بێکـەس سـەرومڕ لـە حاڵـەتی پەشێوی و دڵەکوتەی و پەرێشانی دەروونیدا بووە. لەبـەر ئـەوە کە نیـشتمان پـەروەری و نەتەوە دۆستییەکەی ئەگـەر راسـت بێ بڵێین- شـتێك بـووە لـە نـاخی خۆیـدا و لەسـەر بناغەی هوشیارییەکی زانـستانە نـەبووە، گـەلێ رووداوی رۆژانـە بـە چـاك یـا بـە خـراپ کاری تێ کردووە. لە توێکانی ناوەوەی دەروونیدا، وەك تێکۆشەرێکی هەمیشە سـەربەرز، هێزێك بووە پاڵی پێوە ناوە هەردەم شیعری شانازی بە تێکۆشان، بەقارەمانەتی، بـە ورە بەرنەدانەوە بڵێ.... بە گژی دەردە کۆمەڵایەتییەکاندا بچێ.. پەردە لەرووی توێژە دەس بـڕو ساختەچییەکانی کۆمـەڵ هـەڵماڵێ. نـەدیتنی ئاسۆی روونـی دوارۆژیـش گـەلێ جار شیعری نائۆمێدانەی پێ بنووسێ. هەر چەند بەخەیاڵی خۆی بەڵگەی زانـستانە بـۆ ئـەو نائۆمێدییەشی ئەدۆزێتەوە، بەلام چونکە هۆی راستەقینەی ئەو ناتەواوییانە نازانێ کـە گیـانی نائۆمێدییەکـەی تیـا ئەبزوێننـەوە، ناتوانـێ ئـەنجامی دروسـتیش لـە زانـستەکانی خۆی وەرگرێ، وەك لەم پارچە شیعرەیدا کە ئەڵێ:

کـورد ئەبـەد ناگاتـە مەقـسەد، نۆکـەری بێگانەیـە
دوو دڵـن، پیـسن لەگـەڵ یـەك، بۆیـە وا بـێ لانەیـە
میللـەتێکن بـۆ نـەمانی یـەکتری هـەر هـەوڵ ئـەدەن
داخەکـەم ورد و درشـتی شـێت و شـەیدای ئانەیـە
سەنعەت و عیلم و مـەعاریف زەڕڕەیـەك بـاوی نییـە
پیـاوەتی لایـان بـە تـەنها چـەفتەو و جامانەیـە
بۆ قسەی زل بێ قوسوورن، باسـی کوردییـەت ئەکـەن
کوردییـەت خورمایـە بۆچـی، یـا قـسەی شـێتانەیە

## میللەتی بێ عیلم و ئەخلاق چۆن بە ئیستقلال ئەگا
## واسیتەی بەرزی و تەرەققی هیممەتی مەردانەیە

زۆرجاریش کە ئەبینێ شیعر وتن دەرمانی دەردی بۆ ناکا و هیچی بۆ ناگۆڕێ و جیهانی ناپەسەند خۆی لە بەرچاوی ون ناکا، ئەیەوێ ئەم خۆی لەبەر چاوی ئەو ون کا و بۆ ئەو مەبەستە پەنا ئەباتە بەر خواردنەوە و لەو تاوە رەش و تاریکانەی ژیانیدا پێکەکەی ئەبێ بە فریادڕەسی.

لە مەیدانی باسی نیشتمان پەروەری و ئازایی و بە جەرگی بێکەسدا پێویست بە هێنانەوە یادی پارچە شیعری (بیست و حەوت ساڵە....) نییە چونکە راستەکەی لە یادی زۆربەی خوێندەوارانی شیعریدایە. ئەوەندە بەسە کە بڵێین ئەم پارچە شیعرە کە لەسەردەمی بوونی کۆمەڵەی مەهاباد و بۆ کاربەدەستێکی گەورەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز وتراوە، بانگەوازی ئیفلاسی ئەو بۆچوونە چەوتەیە کە تا ئەو کاتە و بەڵکو هێشتا ئێستاش توێژێکی کەم نای کۆمەڵەی کوردەواری باوەڕیان پێ بووە و بە راستەقینەی یەکەمی ژیانیان زانیوە کە ئەویش ئەوەتە: کورد خۆی هیچی پێ ناکرێ و ئەبێ ئینگلیز و ئەمەریکا شتێکی بۆ بکەن. بێکەس بە ئاشکرا لەم پارچە شیعرەدیدا هەموو فیشاڵ و گفت و درۆی ئیمپریالیزمی ئینگلیز کە ئەو کاتە هەر خۆی بە ناوبانگ بوو هێشتا ئەمەریکا جێی نەگرتبووەوە، ئەداتەوە بە رووی نوێنەرەکەیدا و جارێ رزگاربوونی بیری خۆی لە دوای ئەو ئەدا و مژدەی گرتنەبەری رێگای راست، رێگای ناسینەوەی دۆست و دوژمنی راستەقینە بڵاو ئەکاتەوە. بۆیە لە خۆڕایی نییە لە مێژووی ئەدەبی سیاسی کورددا ئەم پارچە شیعرە بە یەکێ لە نموونە باڵاکانی بەرەنگاربوونی دوژمن و نیشانە دیارییەکانی هوشیاری سیاسی دانراوە.

بەر لەوەی لە لێکدانەوەی رووی سیاسی شیعری بێکەس ببمەوە، ئەمەوێ نموونەیەکی گەشی گیانی شۆڕشگێڕانەی ئەو شاعیرە تێکۆشەرە بخەمە بەرچاو کە پڕە لە شانازی کردن بە قوربانی دانەکانی گەل و رۆڵە دڵسۆزەکانیەوە.... لە متمانە بە دوارۆژی گەل... لە دەستەودامێن بوونی لاوان بۆ بەتین کردنی خەبات.... لە دەستە و یەخە وەستان لەگەڵ ئەوانەی کە خەمی وڵات و گەلیان لە دڵدا نییە و هەر لە سوودی خۆیان ئەگەڕێن.... ئەوەش ئەو پارچە شیعرەیەتی کە بە بۆنەی هێنانەوەی تەرمی چوار ئەفسەرەکەوە نووسیویەتی کە بۆ تۆڵە سەندنەوە لە بەشداربوونیان لە شۆڕشی ١٩٤٥ی کوردی عێراق و رۆیشتنیان بۆ ناو کۆمەڵەی مەهاباد، لە ١٩ حوزەیرانی ١٩٤٧دا لە

بەغدا گران بە دارا. بێکەس ئەم پارچە شیعرە بەسۆزەی لە پێشوازی لێ کردنی تەرمی ئەو شەهیدانەدا وتووە کە دوانیان هێنرابوونەوە بۆ سولەیمانی. بێکەس لەم پارچە شیعرەیدا ئەڵێ:

قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر رووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
میللەتێ لاوی لە رێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە، بێ ترس دەم بە خەندە و پێکەنین
قەومی وا نامرێ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەرێ
ساحێبی رۆڵەی نەبەردە، خاوەنی عەزمی مەتین
ئەو کەسەی گیانی لە رێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردوو، شەهیدە، وا لە فیردەوسی بەرین
لاوی کورد مەردە، لە مردن قەتعییەن باکی نییە
پەندی پێشینانە، راستە "بەرخی نێر بۆ سەر بڕین"
وا وەتەن دیسان بە مەحزوونی ئەڵێ: ئەی لاوەکان
بۆچی وا مات و مەلوولن، بەسیەتی شین و گرین!
رۆژی تێکۆشانە، سا دەی هیممەتێ تاکو زووە
بەشکو لەم حاڵە نەجاتمان بێ و لە دیلی دەربچین!
گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕ ئەکەن
شەو بە بێ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەرسەرین
پیاو ئەبێ دائیم خەمی قەوم و وڵاتی خۆی هەبێ
ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین

لە دوا ساڵەکانی ژیانی بێکەس دا بوو قەڵەمبازەکەی کانوونی دووهەمی ١٩٤٨ رووی دا. قەڵەمبازی کانوونی دووهەمی ١٩٤٨ کارێکی ئێجگار گەورەی کردە بەشێکی زۆری خەڵکی عێراق، چ ئەوانەی لە سیاسەتدا بوون و چ ئەوانەی لێی دوور بوون. توانینی بەزاندنی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و نۆکەرە حوکمڕانەکانی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی

"پۆرت سماوس" و داسەپاندنی ئازادییە دیموکراتییەکان با بۆ ماوەیەکیش بووبێ و، هاوکاری گەرم و گوڕی کورد و عەرەب و لێك ئالانی ئەلقەکانی خەباتی هەر دوو گەل و بەشداری کردنی چالاکانەی ژنان لە خەباتدا و وریا بوونەوەی کۆمەلانی خەلك لە ئاست فێڵ و تەلەکەی جۆر بە جۆری ئیمپریالیستەکان، ئەمانە هەموو بەرهەمی قەلەمبازی ١٩٤٨ان. بەلام بەش بە حالی شاعیرێکی نەتەوەپەرستی وەك بێکەس کە پێشتر بیرێکی رۆشنی لەمەڕ برایەتی کورد و عەرەب و خەباتی پێکەوەی هەر دوو لایانەوە لێ دەرنەکەوتووە، پەیدا بوونی ئەم بیرە گەورەترین ئەنجامی ئەو قەلەمبازەیە. شایانی وتنە ئەم قەلەمبازە هەمان کاری لە پیرەمێردیشدا کردووە کە ئەویش لە گەلێ رووی هوشیارتر بوونی سیاسی خۆیەوە قەرزاری ئەم قەلەمبازەیە.

کاری قەلەمبازی ١٩٤٨ لە بێکەسی نەمردا لە پارچە شیعری "داری ئازادی"یەوە دەرئەکەوێ کە لە بیری خەلکدا بووە بە یەکێك لە پارچە شیعر پڕسۆزە بەشۆڕەتەکانی خەبات:

داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ
پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەقی لە مردن سڵ نەکا
هەر "بڕووخێ" بەس نییە، تاکوو نەسەنرێ، نادرێ
کورد ئەگەر چی موددەتێکە دیل و داماوە، بەلام
باوەڕت بێ رۆحی میللی هەر ئەمێنێ، نامرێ
تۆ ئەگەر ئیسلاحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ
لێت موحەققەق بێ بە بێ شۆڕش ماحالە ناکرێ
بیری ئازادی جیهانی گرتەوە، توخوا بەسە
ئەم نیزامە کۆنە تاکەی؟ هیممەتێ کەن لابرێ
قەت مەلێن دوژمن بەهێزە، تۆپ و تەیارەی هەیە
ئیتتیفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی راگرێ
ئەم عێراقە خۆشەویستە خاکی گوڵ گوون بوو بە خوێن
تا حەقی دەسگیر نەبێ لەو خوێنە دەس هەلناگرێ

نێـر و مـێ هـەر دوو بـە جووتـە بـۆ وەتـەن هـەوڵێ نـەدەن
دووره دەرچــوونی لــە دیلــی، مــەل بــە باڵــێ نــافڕێ
هــەوڵی راســتی هــەر دوو لا ئامــانجی میللــەت ســەر ئــەخا
چـونکە مەعلوومـە بـە یـەك دەس چـەپڵە قـەت لـێ نـادرێ
وا گلۆڵــەی کەوتــە لێــژی، بــاوی ئیــستیعمار نــەما
هـیچ کەسـێ ئـیتر بـە زوڕنـا و تـەپڵی ئـەو هەڵناپـەڕێ
دۆسـتی کـورد و عــەرەب زۆر کۆنــە، تــەئریخ شــاهیدە
ناحــەزی رووڕەش لــە داخــا بــا یەخــەی خــۆی دادڕێ

لەم شیعرەوە بە خەستی هەست بەو کارە ئەکەین کە قەڵەمبازی کانوونی دووهەمی ١٩٤٨ لە دەروونی ئەم خەڵکەدا و لە ناو ئەوانیشا لە دەروونی رۆشنبیرانی وەك بێکەس دا کردبووی. بە جۆرێ متمانەی بە ئەنجام بەخشینی خەبات پێ پەیدا کردبوون. تەنانەت بکەونە زیادەڕەوی و هەڵەیشەوە تیایدا، ئەگینا پاش ١٩٤٨ و تا ئێستاش هەموو لێرە و لەوێ و لە گەلێ شوێنی تردا بە چاوی خۆمان دیمان گلۆڵەی ئیستیعمار بەجۆرێکی وا نەکەوتبووە لێژی باوی نەمێنێ و لە زۆر لای عێراق و شوێنانی ترا کۆڕ و کۆمەڵە و دەستەی زۆر هەبوون و هەن بە زوڕنا و تەپڵی هەڵپەڕن و مەرامەکانی بەجێ بێنن و ببنە پردەباز بۆ هێنانە دی ئاواتە چەپەڵەکانی بەڵام دیارە ئەمڕۆ بێ و سبەی بێ لافاوی هوشیاری و بیرکردنەوەی راست پاشماوەی ئەم دیاردەیەش ڕائەماڵێ و جیهانێکی وا دێتە پێشەوە ناوی ئیمپریالیزمی تەنها لە لاپەڕەی مێژوودا تیا بمێنێتەوە و گەلان، ورد و درشت و گەورە و بچووکیان، بە وەرگرتنی مافی دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان بەختەوەر بن.

بێکەس کۆمەڵێکی زۆر شیعری کۆمەڵایەتیشی هەیە. لەو شیعرانەیەدا رەخنە لە گەلێ رووی ژیانی کۆمەڵایەتمان ئەگرێ. کە ئەڵێم ژیانی کۆمەڵایەتی مەبەستم واتا فراوانەکەی وشەکەیە کە کولتور و ئایین و داب و نەریت و خووڕەوشت و گەلێ بابەتی تریش ئەگرێتەوە. جارجاریش لەم چەشنە شیعرانەیدا ئەوەندە رەش بینە ، وەك بڵێی ترووسکەی چاکەی لەم جیهانەدا بەرچاو ناکەوێ.

هەمووومان ئەزانین کۆمەڵێ لەسەر بناغەی سوودی تایبەتی بەڕێوە بچێ هەموو ئەو بەها کۆمەڵایەتییانەی تیا ئەخرێتە ژێر پێوە کە خەڵکەکە خۆیان لە سەرێکی ترەوە بە

شان و باڵیدا هەڵ ئەدەن و گۆرانی بۆ ئەڵێن. ئەم راستییە زۆر جار وا لە گەڵێ کەس ئەکا متمانەیان بە کەسی تر نەمێنێ و خەڵك هەموو بە گورگ بزانن. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ئەزانین ئەمە راست نییە و دنیا هەمیشە وەك خراپی تیا بووە و تیایە، چاکیشی تیا بووە و تیایە، زۆر جار بە زیادەڕەوی ئەم رووەکەی مەسەلەکە لەبەر چاوی خۆمان ون ئەکەین و تەنها رووە رەش و دێزەکەی ئەبینین، بێ ئەوەی لە خۆمان بپرسین ئەگەر راستە دنیا بەم جۆرەیە کە ئێمە ئەیڵێین، ئەی خۆمان لەم ناوەڕاستەدا ئەبێ چی بین و لە چ بەرەیەك بین؟ کەس بەش بە حاڵی خۆی بیر لەم پرسیارە ناکاتەوە.

بێکەسیش یەکێکە لەوانەی کە تاقی کردنەوەی تاڵ و سوێری ژیان و هاوڕێی بەد و بەدەنگەوە نەهاتنی کۆمەڵ لە رۆژەکانی تەنگ و چەڵەمەیدا، کە ئەوەش بە نیسبەت کەسانی خاوەن هوشیاری کۆمەڵایەتییەوە هەرگیز لە شتێکی سەیر و لە قانوونەکانی سروشت بەدەر دانانرێ. کارێکی خراپیان کردووەتە سەر جۆری بیر کردنەوەی و لە هەندێ شیعریدا ئەو بۆچوونانەی خۆی وەکو راستییەکی ژیان لە قەڵەم داوە و پێشکەشی خەڵکیشی کردوون، کە ئێستاش لەوانەیە دەورێکی نادروست لە پەروەردەکردنی خەڵك و داڕشتنی بیریاندا ببینن، وەك ئەم شیعرانەی کە تیایاندا ئەڵێ:

سەرم سوڕماوە نازانم چ شەخسێ بێ غەش و چاکە!  
لەناو ئەم قەومەدا کێیە لەگەڵ هاوجینسی خۆی پاکە!  
لەلام وا باشە ئێستاکە بە کەس پشتێ نەبەستی تۆ  
لە خزم و دۆست و ئاشنایان هەتا ئەتوانی هەر راکە  
کەس و کارت وەکو مارن، ئومێدت هیچ نەبێ پێیان  
لە ژێر سایەی ئەوان دەرچۆ، برادەر، خۆتی لێ لاکە

دیارە ئەم بیرە هەڵەیە ئەنجامی بۆچوونێکی نادروستی تێگەیشتنی مەعنای ئەو راستییە کە هەر لەم پارچە شیعرەدیدا لە بەیتێکی تریدا دووپاتی ئەکاتەوە کە ئەڵێ:

ئەگەر پارەت نەبێ بە خودا هەزار خزمەت بێ پەشمە  
کە پارەت بوو هەموو عالەم براتە و پێت ئەڵێ کاکە

بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەمجۆرە بیر کردنەوەیە هەمیشە و سەرەمڕی بێکەس نییە. بێکەسیش وەك هەر کەسێکی تر بنیادەمێکە لە گۆشت وخوێن و هەست پێکهاتووە. جاری تەبیعی و جاری ناتەبیعی شی هەیە. تووڕەیی و رووخۆشی، شەڕ و ئاشتی، ترشی و شیرینی لە ژیانی خۆیا بینیوە و ئەبینێ و ، لە هەر دەمێکدا باری ژیانی بەجۆرێ کار ئەکاتە سەر بیر کردنەوەی. ئەوە هەر تەنیا کەسانی بەڕاستی هوشیارن، ئاگاداری خۆیان ئەکەن هەڵنەچن و حوکمی وا نەدەن کە بەرهەمی بارێکی ئێجگار تایبەتی و کاتێکی زۆر تایبەتی و زو بەسەرچوو بێ.

کۆمەڵەی کوردەواری لە سەردەمی بێکەس دا هەر چەند پێشی نابووە قۆناغی سەرمایەدارییەوە و چینی کرێکاریشی تێدا پەیدا بووبوو و قەوارە و تاپۆیەکی تاڕادەیەك پێگەیشتووی هەبوو، بەڵام هێشتا لە بارەی جۆری بیر کردنەوەوە لە دوای دەرەبەگی رزگاری نەبووبوو. خاسیەتێکی بیری دەرەبەگی نووسانە بە داب و نەریتی کۆنەوە و لانەدانە لێی و فیز و خۆڵێ بایی بوونێکی بێ بنچینە و بناغەی راستەقینەیە و کەللەڕەقییە لە ئاست گۆڕانە راستەقینەکانی ژیاندا. بێکەس لە پارچە شیعری "عەیبە... عەیبە"دا رەخنە لە رەوشتێکی کۆمەڵەی دەرەبەگی ئەگرێ کە ئەوەتە مرۆڤ لەبەر شەرمی دەس بەردار بوون لە داب و نەریتی کۆن خۆی تووشی هەزار جۆرە دەرد و مەینەت ئەکا. ئەگەر رەخنەگرتن بووایە بە مایەی پەند وەرگرتنی رەخنە لێ گیراوەکە، ئەبوو ئەم کۆمەڵە دەرزێکی ئەوتۆی لەو پارچە شیعرەی بێکەس وەربگرتایە بەشی ئەوە بکا بیگێڕێتەوە سەر رێگای راست، بەڵام لەم ژیانەدا تەنها هەر ژیان ئەتوانێ دەرسی خەڵك دابدا و ناچاری گۆڕینی سروشتیان بکا و لەوە بەولاوە چارەیەکی تر نییە.

جاری وایش هەیە بێکەس هەست بە ناکۆکییەکانی ژیان ئەکا و دەریان ئەبڕێ، بەڵام چاریانی بۆ نادۆزێتەوە، چونکە ئاستی پێشکەوتوویی کۆمەڵەکەی رێگای ئەوەی نادا. لە پارچە شیعرێکا کە رەخنەی تیا لە بوونی تیپێکی دانس ئەگرێ لە سولەیمانی، رووە خراپەکانی بوونی ئەو تیپە دەرئەبڕێ کە ئەوەتە بووە بە هۆی لات کەوتنی خەڵك و ماڵ بەجێ هێشتنی پیاوان.. لەولای تریشەوە کە تیپەکە ئەڕوا و هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە دۆخی جارانی، لە پارچە شیعرێکی تریدا بێزاری لەوە دەرئەبڕێ کە هەر دنیا تاریك داهات شار چۆڵ و خامۆش ئەبێ و هەر کەس ئەبێ بچێتەوە بۆ ماڵ و ئەگەر ماوەیەکیش بە گفتوگۆیەك شتێکەوە خەریك بن، ئەبێ ئیتر خۆیان بکەن بە ژێر

لێفەدا. هەندێکیش کە پارەدارن، بۆ بەسەر بردنی کاتیان دەس ئەکەن بە قومار کردن و لەم رێگایەوە ماڵیان وێران ئەبێ و قورِ ئەکرێ بە سەریاندا.

دیارە ئەم دوو سەرەی بوون و نەبوونی تیپی دانسەکە هەر دووکیان راستن. ئەم ناکۆکییەی بێکەس بە دەستیەوە داماوە، تەنها ژیانی شارستانییەتی پێشکەوتوو ئەتوانێ چاری بکا، ئەویش لە رێگای فرەکردنی شوێنی رابواردن و گەشە پێدانی گیان و دروونەوە وەك شانۆ و کولوویی مۆسیقا و یانەی کولتوور و سینەمای پیشاندەری فلیمی بەسوود و پەروەردەکەر و شتی وا، وەك لە ژیانی شارانی پێشکەوتووی جیهانا ئەیبینین. بەلاّم وەك دیارە بێکەس دنیا نەدیوە ناتوانێ ئەمە بزانێ و لەگەڵ گلەییەکەیدا لە هاتن و لە چوونی تیپی دانسەکە دروشمی راستیش هەڵبگرێ و رێگای چارەی دەردە کۆمەڵایەتییەکە پیشان بدا.

بێکەس عەودالّی دوای کار و هەولّ و تەقەلا و رەنج دانە کە ببێ بە رەوشتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵ... خەڵك بانگ ئەکا بۆ دەس بەرداربوون لە بێکاری و تەمەڵی و تەوەزەلی.... ئایەت و حەدیس ئەکا بە بەڵگە بۆ قسەکان.... میسالی لەبەرچاو بۆ خەڵك دێنێتەوە.... نابەسەندی کارنەکردنیان ئەخاتە بەرچاو... ئەمە هەمووی لەوەوەیە کە هەموو رۆژێ پۆل پۆل خەڵکی بێکاری دیوە یا لە مزگەوت و تەکیە و خانەقاکاندا بە ناوی خواپەرستییەوە پاڵیان داوەتەوە، یا لە ناو کۆڵان و بازارِا خەریکی سواڵ کردن بوون، بەلاّم دیسان بە داخەوە لەبەر ئەوە کە دەرفەتی تێگەیشتنی راستەقینەی نهێنییەکانی دەردی بێکاری نەبووە و نازانێ خەڵك بۆ بێکار ئەسوورِێنەوە و بۆچی بۆ ژیانیان پشت بە رێگای نادروست ئەبەستن، لای وایە ئەم خەڵکە بێکارە هەر بە ئارەزوو رێگای بێکاری ئەگرنە بەر و تاقەتی کاریان نییە... ئەو ناتوانێ بنەما ئابووری و بیرییەکانی بێکاری دەست نیشان بکات، لەبەر ئەوە هەر هاوار و دادێ کە بۆ کارکردنی ئەکا لەوە ئەچێ لە دۆڵێکی قووڵا هاوار بکا و ئەنجامێکی ئەوتۆ لە ژیانی کۆمەڵدا بەجێ ناهێڵێ.

بێکەس تەقەلای ئەوەشی هەیە کە هۆیەکانی دواکەوتنی گەلەکەی بەو سروشتە بەدانەدا بدۆزێتەوە کە لەناو کۆمەڵ و چین و توێژەکانی کۆمەڵدا بوون. لەمەوە ئەگاتە ئەو ئەنجامە کە هەرچیمان بە سەر دێ ئەنجامی کاری خۆمانە. بێگومان ئەم جۆرە لێکدانەوەیە کە تا رادەیەك یەکسەرە و بە شێوەیەکی میکانیکییە، ئەگەر لە بەستنەوەی ئەنجامیشدا بە هەندێ هۆوە بە هەڵەدا بچێ، رویەکی دروست و یەجگار راست و بایەخداریشی هەیە کە ئەوەتە چارکردنی دەردی هەر کۆمەڵێك بەر لە هەر چی لە دەستی کۆمەڵەکە خۆیدایەتی.

نموونەی ئەم چەشنە بیرکردنەوەیەی بێکەس لە پارچە شیعری "خوا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا"دا بە ئاشکرا دیارە کە ئەمە چەند کۆپلەیەکیەتی:

ئەگەرچــی ئێمــە قــەومێکی زۆریــن،
بــەڵام داخەکــەم چــەوت و خۆخــۆرین
بۆیــە وا لــە ژێــر چــەپۆك و زۆریــن
کاکــە خــوا ئیــشی نابــەجێ ناکــا
تــا کێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناکــا

بــۆ کوشــتنی یــەك گــورج و بــەکارین
ڕۆژێ دەســـتمان بــێ بڵــح و زۆرداریــن
لــــە پێویــــستیدا وەك ژن هــــەژارین
کاکــە خــوا ئیــشی نابــەجێ ناکــا
تــاکێو نــەبینێ بــەفری تــێ ناکــا

مونــەووەر زۆری هــەر لەبــەر نــانی
وەتــەن ئەفرۆشــێ بــە یــەك تــارانی
ئەخاتــە ژێــر پــێ دیــن و ئیمــانی
کاکــە خــوا ئیــشی نابــەجێ ناکــا
تــاکێو نــەبینێ بــەفری تــێ ناکــا

ئەشــرافمان هــەموو بــێ ڕۆح و ســستن
دەخیلــە پــشتیان هــیچ پــێ مەبەســتن
هــەموو نــاکۆك و پــارە پەرســتن
کاکــە خــوا ئیــشی نابــەجێ ناکــا
تــا کێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناکــا

بێکەس لایەنگری ئازادی ئافرەت و خوێندن و کارکردنیەتی. دژی سەرپۆش و عابا و پەچە و چارشێوە.... هەروا دژی خۆ خەریك کردنیەتی بە ئارایشت و خۆڕازاندنەوە. بێکەس بە ئافرەت ئەڵێ جوانی تۆ لە زانست و فێربوون و هاوچەرخایەتیدایە. ژن و پیاو تێکڕا بە دوو قۆڵی تەواوکەری کۆمەڵ دائەنێ. ئەمە بە ئاشکرا لە پارچە شیعری "نەسرین"دا دەرئەکەوێ. وەك لە پارچە شیعری "داری ئازادی" یشدا دەرکەوت.

بێکەس لە پارچە شیعری "نەسرین" دا ئەڵێ:

نەسرین! دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە
وامن پێت ئەڵێم چونکە لە سەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە، چ وادەی شەرمە

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەووڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

مەڵێ من کچم، تۆش وەکو منی
موحتاجی عیلم و فەن و خوێندنی
مەجبووری ئیش و خزمەت کردنی
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە، چ وادەی شەرمە

هێنـــــده دانیــــــشتی پـــــشتت چـــــەماوە
زەرد و لاواز بوویـــــــت هێـــــزت نــــــەماوە
کـــــچی بێگانـــــەت خـــــۆ لەبـــــەر چـــــاوە
هەســـــتە تێکۆشـــــە تـــــا خوێنـــــت گەرمـــــە
ســـــــەرپۆش فـــــڕێ دە، چ وادەی شـــــــەرمە

خـــشڵ و جـــوانی تـــۆ حـــەیا و فێربوونـــە
پاشەڕۆژیـــــشت هـــــەر بـــــەوان روونـــــە
کـــــچی بـــێ عـــــیلم دیـــــل و زەبوونـــــە
هەســـــتە تێکۆشـــــە تـــــا خوێنـــــت گەرمـــــە
ســـــــەرپۆش فـــــڕێ دە، چ وادەی شـــــــەرمە

وەك خوشـــك و بـــرا ئـــەبێ هـــەر دووکمـــان
قـــۆڵی لـــێ هەڵکـــەین بـــچینە مەیـــدان
تـــــا کـــــورد بەرینـــــە ریـــــزی میللـــــەتان
هەســـــتە تێکۆشـــــە تـــــا خوێنـــــت گەرمـــــە
ســـــــەرپۆش فـــــڕێ دە، چ وادەی شـــــــەرمە

بێکەس دوژمـنی بـاوك کوشـتەی شـێخیەتی و پڕوپووچی شـێخەکان و ئـەو ئەفسانە بەناو ئایینیانەیە کە مەلایانی پاشکەوتوو بە ناو خەڵکدا بڵاویان ئەکەنەوە و ئەم ڕەشە خەڵکە بەسەزمانەی پێ لە خشتە ئەبەن. لە شیعرەکانیا دژی کۆڕی دەف لێدان و چەقۆ بەخۆدا کردن و هەڵخستنەوەی دەروێشانە و بە پێـچەوانەی موسوڵمانەتی راستەقینەی دائەنێ.... دژی ئەو بیرە کۆن و رزیوانەیە کە کۆمەڵێکی زۆر لـە مـەلایان بـە خەڵکیانـدا رائەگەیــەنن و کۆمەڵــەیان لــە ژیــانی نــوێ پــێ دوور ئەخەنــەوە.... دژی شـێوەی پاشـکەوتووی لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت بـەجێ مـاوی خوێنـدنی فـەقێ و دژی شـێوەی ژیانیانە. بەراوردی ژیانی وڵاتانی ئیسلام و ئەورووپا ئەکا کە ئەورووپا رێگای زانـست و

هونـەری گرتووەتەبـەر و وا پێشکەوتووە کـە هـەمووومان چاو لـە دەسـتینی و وڵاتـانی ئیـسلامیش لەبـەر مانـەوەیان لەسـەر رێ و شـوێنی سـەردەم بەسەرچـوو هـەروا بـە پاشکەوتوویی ماونەتەوە. ئەم بیرانەی بێکەس لە پارچە شیعری" ئەی مەلا" و "مـەلا و شـێخەکان"دا بـە ئاشـکرا دیـارە. وا لـە پارچـە شـیعری "ئـەی مـەلا" ئـەم کۆپلەیـە هەڵئەبژێرین و ئەیکەین بە نموونە:

هەر دوو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعز و سەرفیترە و زەکات
هـەر هـەواڵی حەشـر و نەشـرم پـێ ئـەڵێن تـاکو مـەمات
بەسـیە لـەم مەوزووعـە لادە، فێـری نوێـژ بـوو کائینـات
ئـەی مـەلا تـۆبی خـودا لـەم فیکـرە کۆنـە لا بـدە
فـەننی تـازەم پـێ نیـشان دە بـۆ تـەرەقی کائینـات
خوایـە! یـەك "لووسـەر" بنێـرێ بـۆ گـەلی کـوردی فـەقیر
تـا نـەجاتی بـێ لـە ژێـر دەسـتی مـەلا و شـێخان و پـیر

لە پارچە شیعری "مەلا و شێخەکان" یش ئەم دوو کۆپلەیە ئەخەینە بەرچاو:

مامـە سـۆفیش وای تەمایـە هـەر بـە ریـشی پانـەوە
قەسـری بـۆ حـازر کرابـێ پـڕ بـە حـۆری جوانـەوە
ئـەو ئـەڵێ جەننـەت بـە ریـشە چـی بەسـەر عیرفانـەوە
سـەد سـەلاحەدین و دارا قیمـەتی یـەك ئانەیـە

چـاوەکەم بـە خـوا خـەیاڵتان خـاوە چـاکی تـێ بگـەن
خـوا یـەکێکی خـۆش ئـەوێ دانـا بـێ خـاوەن عـیلم و فـەن
کـەڵکی بـۆ خـۆی و بەشـەر بـێ، خـادیمی راسـتی وەتـەن
هـای و هـوویی بـێ سـەمەر هـەر کـردەوەی شـێتانەیە

بێکەس لە مەیدانی نووسینی ئەدەبی منالانیشدا ئەبێ بە پێشەنگ دابنرێ. ئەو سەرەڕای ئەو هەموو سرووده نیشتمانی و کۆمەلایەتی و پەروەردەییەی بۆی نووسیون و

لە قوتابخانەکاندا پێی وتوون، کۆمەڵێ شیعری منالانیشی هەیە هەر بە ئامانجی پەروەردە کردن و رێگا پیشاندان لە ژیاندا بۆی داناون. بۆیە رۆژێ لە رۆژان کە مێژووی ئەدەبی منالان لە زمانی کوردیدا ئەنووسرێ، بێکەس لە ریزی پێشەوەی ئەوانەوە ئەبێ کە جێگای شایانی خۆیان لەو مێژووەدا وەرئەگرن.

پێشتر لە پەراوێزی شیعرێکیدا کەمێك باسی ئەو گیانی نائومێدی و رەش بینیەمان کرد کە لە هەندێ پارچەی شیعری بێکەسدا دەرئەکەوێ. راستەکەی ئەم گیانی نائومێدییە هەر چەند لە کەم پارچە شیعری بێکەسدا خۆی دەرئەخا چونکە بێکەس خەباتکەر و رۆڵەی گەلەکەی بووە و خەبات و خزمەتی گەلیش هەرگیز لەگەڵ بە رێباز کردنی رەش بینی و بلاوکردنەوەی گیانی نائومێدی یەك ناگرنەوە، بەلام من وای بۆ ئەچم لە ناخیا چەکەرەیەکی هەرگیز نەمردووی ئەم گیانە بووە. کەسێك بە منالی لەگەڵ دایکیا بکەوێتە نامۆیی، برای لە ئاوی دیجلەدا بخنکێ، باوکی بە هۆی کارەساتی جەنگەوە بکەوێتە تورکیا و ئیتر بڕای بڕ لەگەڵ منالەکانی یەکتری نەبیننەوە.... سەرەتای منالی، بە خۆشی ژیانی منالی کاربەدەستێکی سوپای میری بەسەر بردبێ کەچی لە ساڵە قاتییەکانی جەنگدا لەگەڵ دایکێکی غەریب کەوتووی شاران لە مالی کابرایەکی بێگانەدا بژی لە بەغدا.... هەر بە منالی لە نیعمەتی چاوێکی بێ بەش بووبێ و سەرەڕای ئەوە ئاولەش سەروسیمای ناشیرین کردبێ... ئەو ئەندازە کەمەی خوێندنی بە هەزار مەینەت لە چوار شوێن بۆ تەواو کرابێ، لەگەڵ نەبوونی خوێندەوار و رۆشنبیرا لەو سەردەمەدا مەگەر بە دەگمەن، کە کۆلکە خوێندەوارەکان وەزیفەی بە سەنگ و ترازووی ئەو رۆژە زلیان ئەدرایە، ناچاری جگەرەفرۆشتنی دەستگێڕی ناو چاخانە و بازاڕ و کرێکاری فیرتاو کردنی رێگا ببێ.... پاشانیش کە لەسەر کارێك دایئەنێن، مامۆستایەتی قوتابخانەی لادێ دوور لە شارەکانیشی پێ ڕەوا نەبینن و بەرەو حیللە لێژی کەنەوە و ، لەوە زیاتریش لە کاری دەربکەن... هەر رۆژێ جۆرە راپۆرتێکی لێ بنووسن و ، هەر تاوە داوێکی بۆ بنێنەوە و بەمجۆرە لە رێگای ژیانا دەیان جۆرە کولۆلی و کوێرەوەری بێتە رێ، کەسێکی وا ناهەقی ناگرم ئەگەر خۆی لەم جیهانەدا بە بێکەس و نامۆ دابنێ و لە هەموو داب و نەریتێکی کۆمەڵ یاخی ببێ و جاروبار بۆ بە سووك تەماشا کردنی ئەو بەهایانەی لە کۆمەڵدا فەرمانڕەوان، شیعری وەك ئەم پارچە شیعرە بڵێ:

تووشــی لافـاوی عـیلم بـووم و بـەڵام زوو دەرپـەڕیم
سـواری واپـۆڕی جـەهل بـووم و بـەناویا تێپـەڕیم
سەد شوکر ئۆخەی نەجاتم بوو لـە باسی عـیلم و فـەن
نـامگرن جـارێکی تـر، بۆیـە لـە کـەیفا هەڵپـەڕیم
گەرچـی تـا ئێـستا وتوومـە: تێبگـەن زوو پـێ بگـەن
بەو قسانەم قەتعییەن باوەڕ مەکەن، سەگ بووم وەڕیم
خوێندەواری شێتییە، هەر جەهلە ئینسان سەر ئـەخا
گـەر لەمـەولا نـاوی عـیلمم بـرد بـزانین سەرسـەریم
هێنـدە تـەعقیبی هـەقم کـرد تـاکو نـانی خـۆم بـڕی
سـووك و ریـسوا بـووم لـە نـاوا گـیرۆدەی ئـاخر شـەڕیم
مـن کـە زانـیم حـاڵی زانـا نەفیـە، حەپـسە یـا شـەقە
هـەر کیتـابێکم هـەبوو دوێنـێ لـە داخانـا دڕیـم
پیـاوی دانـا عـەقڵی دانـا، زانـی بـۆی ناچـێتە سـەر
بەرگی نادانی لەبەر کـرد، بـوو بـە خـاوەن زێـڕ و سیم
شـەرتە کـەر بم بـارە گـوێزم لـێ بنـێن خـرەی نـەیێ
بـا دەمـێ زۆر و کـەمێ وەك بـێ غـەمێ بـۆ خـۆم بژیم

ئەمە لە مەیدانی ناوخۆدا.

لە مەیدانی دەرەوەشدا کە ئـەنجامی کاری ئیمپریالیستەکان لـە وڵاتـە ژێردەستـە و داگیرکراوەکانا ببینێ و ناکۆکی لە چار کردن نەهاتووی ئیددیعاکانی ماف گەلان و ژیانی راستـەقینەی گـەلان بێنێتـە بەرچـاو و بڕوانـێ چـۆن چـەکی قەلاچـۆکاری دائـەهێنن و وڵاتانی پێ کاول ئەکەن، هیچ بە سەیری مەزانن جارێکی تر ئەم گیانی بـێ متمانـەیی و ناهومێدییەی سەر هەڵداتەوە و لە تاوێکی بەرچاو تاریکیـدا شیعری وەك ئـەو شیعرەی بڵێ کە بە بۆنەی تەقاندنەوەی بۆمبای ئـەتۆمی ئەمـەریکاوە لـە هێرۆشـیما و ناکـازاکی-وتویەتی:

داخەکـــەم بـــۆ ئـــەو زەمانـــەی رووی زەمـــین
وەك بەهەشــت بــوو پــڕ لــە خۆشــی و پێکــەنین
بێتـــەماع و بـــێ درۆ و خـــاڵی لـــە قـــین
دڵنیـــا و دوور بـــووین لـــە ئۆتـــۆمی لـــەعین
تـــف لـــە عـــیلم و ســـەنعەت و ســـەد کارەبـــا
مەرحـــەبا ئـــەی جـــەهل و وەحـــشەت مەرحـــەبا
یـــادی تـــۆ ئێـــستا لـــە دڵ خـــەم لائـــەبا

عیلمـــە ئێـــستا بۆتـــە مایـــەی دەردیـــسەر
عیلمـــە بۆتـــە واســـیتەی مـــەحوی بەشـــەر
عیلمـــە تەســـخیری ئەکـــەن هـــەر بـــۆ زەرەر
عیلمـــی چـــی؟ وابـــێ، هـــەزار خۆزگـــەم بـــە کـــەر
بـــا وجـــسودی رادیـــــۆ و شـــــەمەندەفەر
وا ئـــــەبێ پێـــــشکەوتن و عـــــیلم و هونـــــەر
تـــف لـــە عـــیلم و ســـەنعەت و ســـەد کارەبـــا
مەرحـــەبا ئـــەی جـــەهل و وەحـــشەت مەرحـــەبا
یـــادی تـــۆ ئێـــستا لـــە دڵ خـــەم لائـــەبا....

باشترین بابەت ئەم پێشەکییەمی پێ دوایی بێنم لاواندنەوەی مامۆستا گۆرانە بۆ بێکەس کە هەر پاش مردنی دەس بەجێ وتوویەتی و یەکەمجار لە یەکەم ژمارەی "گەلاوێژ"ی پاش کۆچی دوایی بێکەسدا لەگەڵ هەواڵی کۆچ کردنەکەیدا بڵاو کراوەتەوە.

گۆران لەم لاواندانەوەیەی بێکەسدا وەڵامی گەلێ پرسیار لەبارەی هونەرمەندێکەوە ئەداتەوە کە لە نزیکەوە ناسیویەتی. گەلێ شتی وای لێك ئەداتەوە کە پێویستمان بە لێکدانەوەیەتی. لێکدانەوەی مامۆستا گۆران، بە تایبەتی لە بابەتی بێکەسدا، بایەخێکی زۆری هەیە چونکە وەك هونەرمەندێك وە وەك هاوچەرخێك و هاوکارێکی لە ئازار و ژانەکانی دەروونیدا لەگەڵی هاوبەش بووە.

ئەمەش تەواوی لاواندنەوەکەی گۆران:

# هاوڕێم بێکەس!

ئەی فریشتەی شیعری جوان
کۆستی کەوتووی هەر دووکمان
بۆ ئەمجارە "بێکەس"ە
کە وتمان "بێکەس"، بەسە
شاعیرێك بوو فەننان بوو
ئەدای خوڕ، خرۆشان بوو
بۆ باغچەی کزی کوردی
بلبل بوو نەغمەی وردی
سەرەڕای بەهرەی فەننی
دڵسۆز بوو بۆ وەتەنی
نرکەی شیعری رزگاری
بێکەس، شتێکە دیاری

لە هەموو کوردستانا
لەناو بیر ئازادانا !

پەری شیعری شۆخ و شەنگ !
تۆ دڵ تەنگ و ، من دڵ تەنگ
! با سکالا بۆ یەکتر
لەگەڵ ئاخی سارد و سڕ
دوورودرێژ هەڵڕێژین
مەیتی بێکەس ئەنێژین !
ئاشنای تۆ بوو هاوڕێی من
لێی داگیرکردن "مردن"!
ئەی پەری! ناڕەوایە

فرمێسك لە چاومان نایە
چونکە بێکەس بچووك بوو
پایەی "کۆمەڵی"ی سووك بوو
کام پیاو ماقووڵ، کام گەورە
کە بەرزی جێی ژوور هەورە
وێنەی ئەو جوامێر بوو
بەرابەر دوژمن شێر بوو
لە کاتێکا، ئەوانە
نۆکەر بوون بۆ "بێگانە"
دەست لەسەر سنگ ئەودستان
یان بۆ پایە، یان بۆ نان
بێکەس بوو وەك پاڵەوان
پەنجەی لە چاوی چەقان
پەنجەی تیژی سەرزەنشت
داخی دڵی خۆی پێ ڕشت!
بەڵێ بێکەس نابووت بوو
جارجار برسی بوو، رووت بوو
بەڵام کام تێر، کام پۆشتە
وێنەی ئەو، ئەی فریشتە،
بێ باك وەستا، بەرامبەر
نووکی سونگی ستەمگەر؟
کێ وا لە ژێر زنجیرا
ئازادی هات بە بیرا،
بە شیعری جوان نەڕانی
بە یادی کوردستانی !
ئەی شۆخ و شەنگ، ئەی پەری!
زۆرتر بۆ ئەوەی بگری
کە بێ بەرگی و بێ نانی
خۆی لە رووی تۆ ئەزانی

لەگەڵ ئەوەش تامردن
نەکەوت لە تۆ پەرستن
ملکەچی قیبلەی رووت بوو
دێوانەی عیشوە و خووت بوو
وەك هەندێ شاعیری تر
تا رادیەك گورچك بڕ
تەماع هەڵی نەفریوان:
شیعر بفرۆشێ بۆ نان،
ئابڕووت بەرێ وەك بردیان
بەو کردەوانەی کردیان!
لە پاشانا، ئەی پەری
نابێ لە بێکەسی بگری
کە گیرۆدەی مەستی بوو
مەستی ئەو مەبەستی بوو
ناوچە و سەردەمی ژینی
پڕ بوو لە ناشیرینی

ولاتی پەرێشان بوو
بۆ هاووڵات زیندان بوو
نەتەوەی هەموو هەژار
مایەی رەنجیان بۆ زۆردار
هەموو برسی، دەغەزار
نەزان و نەخوێندەوار
دیل بوون: هەم بۆ بێگانە
هەم بۆ ئەو زۆردارانە
کە خوێیشیان ئەیانمژین
بۆ خەڵقیشیان سەر ئەبڕین!
ئەمجا کە ئەیدی ئاوا
کەشتی بۆ گەردا و ئەڕوا

هەزاران هاوار بکرێ
کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ
ناچار خۆی سەرخۆش ئەکرد
هەستی فەرامۆش ئەکرد
جارجار کە زۆر پەست ئەبوو
کەمێکیش بەدمەست ئەبوو
داخی دڵی خۆی ئەڕشت
بە جوێن، توانج، سەرزەنشت

ئەی فریشتەی چاو خومار
بەڵام بێکەسی هوشیار
بێکەسی دنیای نووسین
دانەری بەستەی شیرین
مەبەستی من و تۆیە
بۆ ئەوە ئەم ڕۆ-ڕۆیە

تۆ: پەری شیعر و جوانی
من: هاوڕێی گیانی گیانی

دانیشین بە جووت دڵتەنگ
بڕێژین فرمێسکی مەنگ
بۆ شاعیرێك "بێکەس" بوو
بەڵام "کەس" ئێمەی بەس بوو
تۆ باڵای بۆ ڕەشپۆش کە
گڕی شیوەنی خۆش کە
بە پەردەی نزمی ماتەم
بەستەی کوردی پڕ لە خەم
لەسەر مەیتی بخوێنە
وەفای جوانی بنوێنە

بۆ شاعیرێك كە گیانی
لێی هەڵئەقوڵا جوانی
ئەگەرچی هۆی بەختی خۆی
جوانی فەساڵ نەبوو بۆی
ناقۆلا و تێكسمڕاو بوو
روومەت كونج، كزی چاو بوو
هونەر بوو، رووخۆشی بوو
كە خەوشی داپۆشیبوو
بەلام، پەری! تۆ ژیری
خاوەندی هۆش و بیری
جوانی بالا و دەم و چاو
بەهرەی تا سەر نین بۆ پیاو
هەزار چاو جوان، قەد باریك
كەوتۆتە چاڵی تاریك
چی بەجێ ما لە دوایان
بۆ دۆست و ئاشنایان
یا جوانێك تا پیری ما!
كام گیرۆدەی بیری ما

خوێنی كوڵمی چەند گەش بوو
چاو و برۆی چەند رەش بوو
یەك جوانییە بای پایز
گەلای زەرد ناكا هەرگیز
كە لە گیان، سەرچاوەی دڵ
سەر هەڵئەدا قوڵە- قوڵ
وەك رۆح سووكی، رووخۆشی
خوێن گەرمی، خزمەت كۆشی
دڵی باش، دەروونی پاك
بیری روون، كردەوەی چاك

پێشتری گشت ئەمانە
بەهرەی هونەری جوانە!
بەڕاستی ئەو فەننان بوو
سەلیقەی شیعری جوان بوو

ئەی شێوە شۆخ! ئەی پەری!
دانیشە لای ژوور سەری
وەك یاری وەفادار بە!
بەڕاستی خەفەتبار بە!
قژی زەرد با پەشێو بێ
بەستەی خەم لەسەر لێو بێ
تۆ بڵێ و منی هاوڕێ
تا دەستم قەڵەم بگرێ
ئەنووسم دێڕ دێڕ، بەن بەن
بۆ "بێکەس" شیعری شیوەن!

# فیكری سەركەوتن

فیكری سەركەوتن بە بێ شك، ئەی رەفیقان، غیرەتە[١]
فەوز و ئیقباڵ و تەعالی هەر بە سایەی هیممەتە
قەومی كورد ئەمڕۆ كە دائیم وا لە حاڵی حەسرەتە
باعیسی فیتنە و فەساد و دوودڵی ناو میللەتە
قەومی كورد، شێرانی مللەت! فیكری وەحشەت لابدەن
وەختی تێكۆشینە ئەمڕۆ، رۆژی عیلم و سەنعەتە
میللەتی بێ عیلم و سەنعەت باوەڕت بێ دائیما
وا لە ژێر پێی ئەجنەبی دا ناوی هەر بێ قیمەتە
سەیری كە و تێفكرە نەختێ چی بەسەرهات قەومی كورد
سووك و بێ ناوونیشانە و ژینی دەرد و زیللەتە[٢]
گەر بە دڵ بێت و هەوڵ دەین بۆ تەرەقی قەومی كورد
نائیلی جێگەو حوقووقی خۆی ئەبێ ئەم میللەتە[٣]
هەوڵ و تێكۆشین بە تەنها هەر بە دەم كەڵكی نییە[٤]
گرمە گرمی هەوری بێ باران نیشانەی زەیقەتە

سلێمانی-١٩٢٥

---

[١] لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە:
فیكری سەركەوتن لە ناوا گەر هەبێ هەر غیرەتە
لە نوسخەیەكی تریشدا لە جیاتی "لەناوا" نووسراوە "لە كوردا".
[٢] لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە:
بێكەس و بێ دەر، موهاجیر، عەیش و نۆشی زیللەتە.
[٣] جێگەو: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "ناوو".
[٤] لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە:
كۆششیش نابێ بە دەم بێ بەڵكو "فعلا" لازمە.

# ئامۆژگاری بۆ میللەت

کـوردە تـا کـەی بـێ خەبـەر بـی؟ نووسـتنت بـێ عارییـە
واسـیتەی دواکـەوتنت ئەمڕۆکـە هـەر بـێ کارییـە
سەیری ئەم قەومانە کە چۆن بوون و ئێستا بوون بە چی
حەیفـە بـۆ تـۆ وا ئەسـیری بوویتـە عەبـد و جاریـە
ئیتتیفاقێ گـەر نەکەی، لـەم جەهلە خۆت رزگـار نەکەی
پاشـەڕۆژت قەڵبـە بـە خـوا، عـەیش و نۆشـت زارییـە
مەرهـەم و دەرمـانی دەردت ئیتتفاقـە ئیتتفـاق
دوو دڵـی میقرۆبـە، خزمـە، عیللـەتێکی کارییـە[1]
نیوەڕۆیـە هەسـتە ئـیتر بـەرگی سـستی داکەنـە
زوڵمـەتی شـەو وا بەسەرچـوو، وەعـدەیی هوشـیارییە
رێـی نـەزانی بـەر بـدە و رێگـەی مـەعاریف بگـرە بـەر
نیـشتمانت زۆر کەساسـە و ژیـنی هـەر غەمبارییـە
"بێکەسـا" قـەتعی ئومێـدی سـەربەخۆیی قـەت نەکـەی
کـوردەواری زینـدووە، موحتـاجی لـوتفی بارییـە....

هەولێر ١٩٢٨

[1] خزمە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "پەشمە". کارییە" لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "سارییە"

# ئەی وەتەن...

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
وەختی بەندی و ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە
من لەزیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی
حەپس و تێ هەڵدان وزیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە
بەو خودایەی بێ شەریك و لامەکان و واحیدە[1]
عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر[2]
قەت گڕ و گڵپە و بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونی و کەساسی خۆت نەکەی توخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینی تا بەکەی، دەی پێکەنە و سەر هەڵبڕە
موفتەخیر بە شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە
نەگبەتی لاچوو سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە
گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لێك بێتەوە
لاف میللی یەت بە دەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییە
ڕۆژی هەوڵە هەر بە هیممەت گۆی هونەر ئەبڕێتەوە
بێ قوسوورە چەند جەسوورە سەد شوکر ئەولادەکەت
وا لە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە[3]
بەسیە تەعنەم لێ مەدە هەر ڕۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمەت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە....

سلێمانی ئەیلوولی ١٩٣٠

---

[1] لامەکان و واحیدە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "تاك و تەنیا و بێکەسە".
[2] هەزار ساڵ: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "بە شیددەت" و لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "کە سەدساڵ".
[3] وا لە ڕێی تۆدا: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "وا لە ژێر پێدا".

# وەفدی کوردستان

("پێنج خشتەکی لەسەر شیعری پیرەمێرد")

قەدری میللەتتان بە جاریٚ شکان
نە حەیاتان ما نە ناوونیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەرشان
"وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان"

حاجی تووتنەکەت مادەم فرۆشرا
ڤیروسیا لە سەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە رێکەوە خێرا
"دەسکیٚ لەو گوڵەی باغەکەی سەرا
کەوا بە خوێنی لاوان ئاو درا"

تاقمیٚ رێك خەن زۆر بە پڕ لاقی
بە بەزم و رەزم و ئاهەنگ و ساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی"
بیبەنە بەردەم عەرشی عێراقی
بڵێن یار باقی و ، هەم سوحبەت باقی"

نە بارانتان دی، نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران بە گوللە و شەستیر[1]
نە پێی نازداران خرایە زنجیر
"پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆی دلگیر؟"

---

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندیٚ نوسخەدا بەم جۆرەیە: نە لاوان کوژران بە سونگی و شەستیر

هاوار بە ماڵم چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا سەدمان لێ خرا[1]
هێشتا خەلاتیان ئەکەن بە بەرا"
دەك خەجاڵەت بن لە رۆی مەحشەرا
ئێمەیش خاکی غەم ئەکەین بە سەرا

"قەت وا تێ نەگەن چاومان شکاوە[2]
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لەناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە؟[3]
"خەیاڵتان خاوە کورد نەفەوتاوە
بەراتی نەجات بە خوێن نووسراوە"

میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لەت و پەت کرێ حوقووقی ئەوێ
"من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ[4]
مژدەی شەفەقی لێ دەر ئەکەوێ"

سلێمانی ١٩٣١

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆردیە:
لە چارەکێکا سەد ماڵێ کوژرا
[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆردیە:
قەت وا تێ نەگەن چاومان ترساوە
[3] کەی حەق سەنراوە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "حەق نەسەنراوە".
[4] سوورم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "ئاڵم".

# یادی نیشتمانی کوردستان

من که مەحرووم بووم لە وەسڵت تازە ژینم بۆ چییە؟[1]
حورمەت و جاه و جەلال و رۆح و دینم بۆ چییە؟
دڵ لەبەر دووری و فیراقت پڕ لە قەهر و میحنەتە
شیوەن و گریانە عەیشم، پێکەنینم بۆ چییە؟[2]
باعیسی رووناکی قەلب و نووری چاوم تۆی، وەتەن
چی لە دونیا کەم بە بێ تۆ جێنیشنم بۆ چییە؟[3]
من کە خاکی پاکی کوردستانی نازدارم هەبێ[4]
چی لە قەتعەی ئەورووپا کەم، موڵکی چینم بۆ چییە؟
مەنزەرەی جوان و تەبیعی زۆرە لەم خاکەی منا
مەنزەرەی سونعی بە بۆیەی سەوز و شینم بۆ چییە؟[5]
من کە خۆشاوی زەریف و شەربەتی مێوژم ببێ
نامەوێ شەمپانیا و ، ئەسکەنجەبینم بۆ چییە؟
بۆیە خوڵقاوم کە خزمەت کەم نە وەك هەر دانیشم
بۆ وەتەن گەر تێ نەکۆشم هێز و تین بۆ چییە؟

بەغدا

[1] مەحرووم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "بێبەش".
[2] ئەم بەیتە لە چاپی یەکەمدا نییە.
[3] باعیسی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "واسیتەی".
[4] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
سەرچنار و شارەزوور و دەشتی بازیانم هەبێ
[5] ئەم بەیتەش لە چاپی یەکەمدا نییە.

## ئەی وەتەن....

ئــــەی وەتـــــەن بـــۆ خزمـــــەتت دائـــیم لـــــە ڕێتـــا حـــازرم
بــــاوەڕت بــــێ مـــــن لـــــە زومــــــرەی لاوەکانتـــــا نـــــادرم
گــــەر لەســـــەر تـــــۆ بێتـــو تووشـــی ســـــەد بـــــەلا بم ســـابیرم
خـــوا ئـــــەزانێ چـــەند لـــــە عاســـتی تـــۆ کـــــە پـــاك و تـــــاهیرم
طعنـــــــه اغیــــــار ایلـــــــه اولـــــــلاز مکـــــــدر خــــــاطرم
هــــــای و هـــــــوی ابلـــــــهان اطلنجــــــةدر دیوانـــــــه یـــــه"

## تاقی کیسرا

چی بەسەرهات تاقی کیسرا، هەیئەتی سوڵتان ڕەشاد
حوکمی هارونەڕەشید و تەخت و بەختی کەیقوباد؟
چەند هەزار ئینسانی نازدار جوملە بوونە خاك و خۆڵ
کوورەیی ئەرزیش سەراسەر پڕ لە ئێسقانی عیباد
نەسرەت و ماڵی جیهانیش بێ بەقایە ئەی ڕەفیق
عاقیبەت دنیا نەمانە قەت نەکەی فیتنە و فەساد
فرسەتە، عومری عەزیزت بێ سەعی زایع مەکە
تەرکی ئەربابی جەفا کە و ڕێی فەلاکەت مەگرە یاد[١]

---

[١] تەرکی ئەربابی جەفا کە: لە دەسنووسەکەی بەردەستمانا نووسرا بوو "تەرکی ئەربابی سەفا کە". ئێمە ئەوەمان بە هەڵە زانی.

# شینی مەحموود جەودەت

وەتەن هەڵڕێژە ئەشکی خوێنینت
بابەرز بێ سەدای شین و ناڵینت
گوێی فەلەك کەڕ کا فەریاد و شینت
تاریك و لێڵ بێ ئاسمانی شینت
ئاه و هەناسەی دڵەی خەمگینت
داپۆشێ تیشکی خۆری زێڕینت
هەڵوەرێ پەڕەی گوڵ و نەسرینت
لە جێی گوڵ دڕك دەرکا زەمینت
بەهارت، پایز، زستان، هاوینت
لە باتی بولبول بوومی باڵ شینت
بخوێنێ لەسەر خاکی حەزینت
شادیت شیوەن بێ بە موددەی ژینت
بۆ جگەرگۆشە و رۆڵەی شیرینت
کوردە تۆ بگری بۆ قارەمانت
بۆ لاوی چاك و مەردی مەیدانت
بۆ باغەوانی باغی ژیانت
بۆ رەمزی بەرزی شەرەف و شانت
بۆ ئەوەی لە ڕێی عیززەتی نەفسا
بێ باکانە خۆی کردە قوربانت
بگری بۆ وەفا و سەخاو حەمییەت
بگری بۆ غیرەت، هیممەت، جیدییەت
بگری تا ماوی بۆ "مەحموود جەودەت"
شادیت شیوەن بێ بە موددەی ژینت
بۆ جگەرگۆشە و ڕۆڵەی شیرینت

وەتەن تۆ حەقتە هەر هاوارت بێ
کێ لە دوای "محمود" فیداکارت بێ
کێی تر دڵسۆزی جان نیسارت بێ
دوژمن بە جەستەی حاڵی زارت بێ
کۆچ کردەی ئازیز بە خوام سپاردی
هەزاران ڕەحمەت لە مەزارت بێ
"جنەالماوی" جێ و قەرارت بێ
سەبووری دڵەی کەس و کارت بێ
ئەی وەتەن بیستی تەشرینی سانی
ڕۆژی ماتەم و غەم شیعارت بێ
شیعرەکەی "بێکەس" یادگارت بێ
شادیت شیوەن بێ بە موددەی ژینت
بۆ جگەرگۆشە و ڕۆڵەی شیرینت

بەغدا تەشرینی دووەمی ١٩٣٧

# ئەی کورد بەسیەتی

ئـــەی کـــورد بەســـیەتی تـــا کـــەی ئـــەم شـــیوەن و فوغانـــە
بـــێ ســـوودە ئـــۆف و ئامـــان لـــەم عەســـرە بـــێ ئەمانـــە
پاڕانـــــەوە و کەساســـــی بـــــێ کەڵکـــــە پـــــارە ناکـــــا
عـــەزم و ســـــەبات و غـــــیرەت پێویـــستە لـــــەم زەمانـــــە

حوڕڕییـــــەت و عەدالـــــەت دڕۆیـــــە بـــــێ ئەساســـــە
بـــــۆ دەس بڕینـــــە گـــــشتی ئـــــەم هـــــەموو دەنگوباســـــە
گـــەر تـــەفرە خـــۆی بەمانـــە خوێنـــت ئەکرێتـــە کاســـە
ژیـــانی کامـــەرانی بـــە هـــەوڵ و ڕەنجـــی شـــانە

ئـــەم خاکـــە پاکـــە عـــەینی بەهەشـــتە حەیفـــە وا بـــێ
وێـــران و ســـووك و بێکـــەس، ئەســـیر و بێنـــەوا بـــێ
ئـــەم حاڵـــە تاڵـــە بەســـیە تـــا کـــەی ئـــیتر ئـــەوا بـــێ
شـــەوگاری شـــووم بەسەرچـــوو، گـــەرد و گـــوڵی بەیانـــە

ئەگـــەر بـــە شـــێنەیی بـــی ڕەنجـــت هـــەموو بـــە بایـــە
چـــونکە ئـــەم ڕۆژە ڕۆژی ســـورعەت و کەهرەبایـــە
ئـــیش کـــەن بـــە دەســـت و بـــردی، فرســـەتە، وەرنـــە کایـــە
گـــەلی چـــالاك و خێـــرا ســـەربەرز و شـــادمانە

ئـــەم کـــوردە گـــوردە ئێـــستا کـــە بێکـــەس و هـــەژارە
ملـــی بـــۆ شـــیری دوژمـــن خـــوار و کـــەچ و لـــەبارە
قـــەومێکی هێنـــد نەبـــەردە یـــەکی بەشـــی هـــەزارە
خـــوا گـــەورەکانی بگـــرێ بـــێ کـــەڵك و هـــیچ نەزانـــە

دەخیلـــە لادە "بێکـــەس" لـــەم کەڵکەڵـــە و خەیاڵـــە
بڵـــێ بـــە ســـاقی هەســـتێ بـــۆت پـــڕ بکـــا پیاڵـــە
ئـــەم پەنـــد و شـــیعری تۆیـــە بـــێ قیمـــەت و بەتاڵـــە
میللـــەت کـــە بـــێ زەعـــیم بـــوو ژیـــانی زۆر گرانـــە

سلێمانی

# دەردی دەروون

کــورد ئەبــەد ناگاتــە مەقــسەد نۆکــەری بێگانەیــە
دوودڵــن، پیــسن لەگــەڵ یــەك، بۆیــە وا بــێ لانەیــە
میللــەتێکن بــۆ نــەمانی یــەکتری هــەر هــەوڵ ئــەدەن
داخەکــەم ورد و درشــتی شــێت و شــەیدای ئانەیــە[1]
سـەنعەت و عـیلم و مـەعاریف زەڕڕەیـەك بـاوی نییـە
پیــاوەتی لایــان بــە تــەنها چــەفتە و جامانەیــە[2]
بـۆ قـسەی زل بـێ قوسـوورن، باسـی کوردییـەت ئەکـەن
کوردییــەت خورمایــە بۆچــی، یــا قــسەی شــێتانەیە
میللـەتی بێ عـیلم و ئـەخلاق چۆن بـە ئیـستیقلال ئـەگا
واســیتەی بــەرزی و تــەرەقی هیممــەتی مەردانەیــە[3]

سلێمانی

---

[1] داخەکەم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "جوملەگی".
[2] زەڕڕەیەك: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "سەد ئەسەف" لایان: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "لامان".
[3] بێ عیلم و ئەخلاق: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "بێ هێز و تین بێ".

# ستایش[1]

لـه کـوردا ئـەو کەسـەی ئێـستا بـە ویجدانـە کـەوا مـەردە
کە سەربەست بێ ئەلەم ڕۆژا ئەویش بێ میسل و هەم فەردە
نـەزیری ئـەو لـە دنیـادا نییـە و نابـێ هـەتا مەحـشەر
دڵـی دەرحـەق بەهاوجینـسی بلـووری سـاف بـێ گـەردە
بە ڕەحم و شەفقەتە دائیم لە بۆ شەخصێ کە بێدەست بێ
ئەوی حەز بـەو نـەکا بـێ شـك لـەلای خـوا ڕووڕەش و زەردە
تەبیعـەت حاتـەمی تـائی، لـە فیکـرا چەشـنی لوقمانـە
لـە حـیلم و حەوسـەلە و ئیـشدا دڵی ڕەق ڕەق وەکو بـەردە
نیـشانەی فـەخرە بـۆ ئێمـە کـە زاتێکـی وەهامـان بـێ
ئیلاهـی بەرقـەراری کـەی چـراغی میللـەتی کـوردە

[1] بۆمان ساغ نەکرایەوە بێکەس ئەم پارچە شیعرەی بۆ ستایش کردنی کێ وتووە.

# هوشیاری

ئـەو کەسـەی لـەم قەومـەدا غایـەی هـەموو غەمخوارییـە
بـۆ حـەیاتی میللـەتی، دەردێکـی پیـسی سـاری یـە
مردنـی چـاتر لـە ژینـە چـونکە بـوونی نەگبەتـە
بایـەقوش ئاسـا هـەموو جووڵانـەوەی بەدکارییـە
گـەر کەسـێ عـەقڵی هـەبێ، نـامووس و ویجـدانی هـەبێ
........................[1]

چـۆن ئـەکا حاشـا لـە ئەسـڵ و میللـەت و جینـسییەتی
مـائیلی ئـەغیار ئـەبێ، فیکـری لەگـەڵ ئـەو جارییـە
ئـەو کەسـانە هـیچ و پووچـن، وەزن و مـەعنایان نییـە
بـاڵ و باڵایـان لـە بـەرگی شـەرم و نـامووس عارییـە

---

[1] ئەم نیوە دێڕە لە دەسنووسەکەی بەر دەستمانا سووتابوو.

# دەردی دەروون

ئـەو کەسـەی مـاڵی نییـە و بێ نەقد و موڵك و سـەروەتە
جـــەرگی ســـووتاوی وەتـــەن، رۆحـــی فیـــدایی میللەتـــە
بـــۆ ســـەعادەت بـــۆ وەتـــەن ســـاحێب....[1] جۆشـــی ئـــەوە
ئـەو دڵـەی بـۆ سـەربەخۆیی پـڕ لـە قـەهر و میحنەتـە
ئـــەو دەزانـــێ "فی الحقیقـــە" قیمـــەت و قـــەدری نییـــە
ســاحێبی حیـسس و بڵنـدی و هەمـدەمی میللـی ییەتـە
هەرچـی مـاڵ و خـان و مـان و سـەروەتی زۆری هەیـە
دوژمـنی میللـی ییـەت و، بـێ غـیرەت و بـێ حورمەتـە
ئانەیـەك بـۆ نـەفعی شەخـسی سـەد وەتـەن دێنـێ لـە لای
بابـە کوشـتەی خـۆ خوسووسـەن حاڵـەتی حوڕڕییەتـە
نـاوی قـەومی لا بـەری بـێ شـوبهە گاڵتـەت پـێ ئـەکات
پێت ئـەڵێ: ئەحمەق! ئەمـە ئیشی کـەرە ئـەم خولقەتـە
میللەتی چی، قەومی چی، بەرزی و سەعادەت یەعنی چی؟
بـۆ ئـەدەی دەورەی دەماغـت بـەم خـەیاڵ و فیکرەتـە؟
میللـەتێ تـو خـوا وەهـا بـێ گـەورەکانی، چـۆن ئـەژی
رۆحـی مـردووی پیـاوی گـەورە نەگبـەتی نـاو میللەتـە

---

[1] ئەو وشەیەمان بۆ راست نەکرایەوە کە لەدەستنوسەکەدا لەم شوێنەدا نووسرابوو.

# دەردی دەروون[1]

وان وە بـــان غـــەیرە ئـــەم قـــەومی خۆمـــە
مـــەحکوومی حیـــز و خـــەڕات و دۆمـــە
نـــامووس و ویجـــدان، غـــیرەت و شـــەرەف
لـــەناو ئەشـــرافا بـــاری کـــرد، ئەســـەف

فیکـــری میللـــی ییـــەت ئێـــستا مەعدوومـــە
پیـــاوی مونـــەووەر لات و مەزڵوومـــە
هـــاوار رۆژێکـــی چـــەند قـــەڵب و شـــوومە
لـــە عەیـــشی دنیـــا زار و مەزڵوومـــە

ئـــەوەی خـــائینی موڵـــك و میللەتـــە
دائـــیم لـــە بـــەحری نـــاز و نیعمەتـــە
هـــەر وەتـــەن پـــەروەر غـــەرقی زیللەتـــە
خـــۆراك و خـــەوی دەرد و میحنەتـــە

ئەجنـــەبی دەرحـــەق بـــە ئێمـــە باشـــە
ئـــەوی خراپـــە هـــەر وەتـــەن داشـــە
کـــە بـــوو بـــە مـــەئموور ئەبێتـــە واشـــە
ئیمـــان و دیـــنی تـــەنها مەعاشـــە

---

[1] وان وە بـان غـەیرە: مـەعنای ئـەم برگەیـە نـازانم. لـە دەستنووسـەکەدا چـۆن نووسـرابوو هـەر وا نووسیمەوە "محمد"

میللەت ئەوەندە نەفام و کەرن
بێ عەقڵ و جاهیل، زۆر بێ جەوهەرن
هەرچی مەئموور بوو حورمەتی ئەگرن
داوای ژنیان کەن، رەنگە بۆی بەرن

ئومێدم ئیتر بەم کوردە نەما
نابێ بە ئینسان لە ناو عالەما
بمێنێ هەتا لە دەرد و غەما
هەر ئەناڵێنێ لە ژێر قەدەما

قەومێ کە دائیم هەر هەوڵ بدەن
بۆ ئەمەی یەکتر بەئەرزا بخەن
با نەبێ لایان میللەت و وەتەن
ئایا مومکینە تەرەققی بکەن

بەسیەتی "بێکەس"، خەیاڵت خاوە
چیت لە مەسەلەی میللی ییەت داوە
هەزاری وەك تۆ کە رەنجی داوە
سووك و پەریشان قەدری نەماوە

ئەگەر ئەتەوێ بژیت بە خۆشی
بە روپیە ئەبێ قەومت بفرۆشی
لە موڵك و میللەت چاوت بپۆشی
جامی دەنائەت ئەبێ بنۆشی

نـــــابینی ئێـــــستا کـــــه ئـــــەوی وایـــــه
ژیـــــانی هـــــەموو کـــــەیف و ســـــەفایە
هـــــەر وەتـــــەن پـــــەروەر غـــــەرقی جەفایـــــه
قیمـــــەتی نییـــــه ڕەنجـــــی بـــــه بایـــــه

"اســـــتغفرالله" مـــــن لەوانـــــه نـــــیم
قـــــەت ناخەڵـــــەتێم بـــــه ئـــــاڵتوون و ســـــیم
بـــــاوەڕم پـــــێ بکـــــەن کـــــوڕێکی جیـــــددیم
تـــــا لـــــه دنیـــــادا ســـــەعاتێ بـــــژیم

خـــــراپ ببیـــــنم تەنقیـــــدی دەکـــــەم
ئـــــەوی خائینـــــه جـــــوێنی پـــــێ دەدەم
ناترســـــم لـــــه کـــــەس بـــــێ بـــــاك و بـــــێ غـــــەم
هەرچـــــی کـــــه ئـــــەبێ، ببـــــێ، جەهەننـــــەم

نـــــانێکم ببـــــێ وەکـــــو پادشـــــام
نایـــــدەم بـــــه خـــــاکی گـــــشت عێـــــراق و شـــــام
شـــــوکری خـــــوا ئەکـــــەم دائـــــیم ســـــوبح و شـــــام
........[1]

[1] ئەم دوا نیو بەیتە لە دەستنووسەکەی بەردەستمادا سووتابوو.

# ئەی وەتەن

ئـەی وەتــەن مـن هـەر بـە یـادی تـۆوە شـەوگاران ئـەنووم
"کـــل صـــبح بهـــواك اســـتفيق واقـــوم"
خۆزگـە سـەد خۆزگـە خودایـە ئێسته مـن تـەیرێ ئـەبووم
"بجنـــاحي اطـــير، في صـــحاريك احـــوم"
"تـــارة فـــوق الجبـــال، تـــارة بـــين الكـــروم"

ئـەی وەتــەن زۆر ئـارەزووی دیـداری خـاکی تـۆ ئەکـەم
"ان مـــراك يزيـــل مـــن فـــؤادي ذا الالم"
غـەیری تـۆ گیانـە بـە چیتر ئـەم دڵەی خـۆم خـۆش بکـەم
"انـــت تـــشفى مـــا بقلـــبى مـــن هيـــام او ســـقم"
"انـــت دائـــى و دوائـــى و ســـرورى والـــنقم"[1]

ئـەی وەتــەن دلگـیرە خاکـت، بـا سـەفایە و پـڕ سـروور
"كـــل مـــا فيـــك جميـــل بمـــلا القلـــب حبـــور"
دەشـتی تـۆ فەسـڵی بـەهاران پـڕ گـوڵ و غیلمـان و حـوور
"اينمـــا كنـــت سمعـــت صـــوت تغريـــد الطيـــور"
"منـــشدا يـــا نـــاس بـــشرى قـــد اتـــى فـــصل الزهـــور"

حیللە. ١٢ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٧

---

[1] والنقم: لە دەسنووسێ:ی لای مامۆستا کەریم شارەزادا نووسراوە "والنعم". بڕوانـەرە: کـەریم شـارەزا سەرچاوەی پێشوو."

# سەدەی بیستەمە

سەدەی بیستەمە، کوردە غیرەتێ
لە خەو راپەڕە، هەوڵێ هیممەتێ
بەسیە نەزانی، عیلم و سەنعەتێ
سووکی هەتا کەی؟ ناوێ، حورمەتێ
هۆش و بیرت بێ..... پیاوی ژیرت بێ.....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

نەما ئەو رۆژەی تۆ بە ئاسانی
بتوانی بژی بە شادمانی
تۆ کە قەومێکی بێ پشتیوانی
گەر تێ نەکۆشی زۆر پەرێشانی
هۆش و بیرت بێ... پیاوی ژیرت بێ....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

رۆژی کارەبا و رادیۆ و بوخارە
هەر قووەت و فەن ئەمڕۆ بە کارە
گەلی دواکەوتوو بەشی جەخارە
قوڕ بەسەر ئەوەی پەست و هەژارە
هۆش و بیرت بێ.....پیاوی ژیرت بێ.....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

لە رووی زەمینا نییە وەکو تۆ
قەومێکی دوو دڵ، دیل و رەنجەڕۆ
کەڵکی چی ئەگرێ گریان و رۆرۆ
درەنگە هەستە بوو بە نیوەڕۆ
هۆش و بیرت بێ..... پیاوی ژیرت بێ....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

سەیری عالەم کە بۆ بەرزی و ژیان
خۆی هەڵکردووە هاتۆتە مەیدان
لە ڕێی نیشتمان ئەبێتە قوربان
بۆ سەرکەوتن و بۆ ناوونیشان
هۆش و بیرت بێ..... پیاوی ژیرت بێ...
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

سبەینێ کە جەنگ دامرکایەوە
ئاگری هەرا و شەڕ کوژایەوە
هەر کەس حەقی خۆی پێ درایەوە
تۆ بە چ ڕوویەك دێیتە کایەوە؟
هۆش و بیرت بێ.... پیاوی ژیرت بێ....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

پێم بڵێ کوانێ وەتەن پەروەرت؟
کوا لاوی دانا و ، کوا مونەووەرت؟
کوانێ دڵسۆز و ، کوانێ رەهبەرت؟
ناوی خۆت نەبەی ئەی خاك بە سەرت!
هۆش و بیرت بێ.....پیاوی ژیرت بێ...
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

دەرمانی دەردی ئێمە خوێندنە
رەوشتی پاك و خزمەت کردنە
تۆوی ناکۆکی زوو لابردنە
ئەگینا بەشمان شەق و مردنە
هۆش و بیرت بێ..... پیاوی ژیرت بێ....
لە جێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟

سلێمانی ١٩٤٣

# چاوبەست

دەنگ بڵاوە خەڵق ئەڵێن ئەمجارە کورد سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بیڵێن، لەلام وایە درۆ و چاوبەست ئەبێ
سەد هەزار جارمان سیاسەت تەجروبە کرد و کەچی
ئێستەکەش زۆرمان بە فیشاڵی وەها سەرمەست ئەبێ
بێت و بەینی..... و .... زەڕڕەیەك تێك چی ئیتر
مەسەلەی کوردایەتی ئەوسا بە جارێ خەست ئەبێ
کەی حوقووق ئەدرێ ؟ ئەسەنرێ، عەیبە ئیتر تێ بگەن!
سەربەخۆیی چۆن نسیبی قەومی وا بێ دەست ئەبێ
میللەتی جاهیل لە دنیادا ئەبێ هەر بەندە بێ
نۆکەری هەر خشت بە باڵای قەومی دیل و پەست ئەبێ

سلێمانی ١٩٤٤

# بیستەی ژین

بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٢٠ ساڵەوە بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەی "ژین"دا وتراوە و لە ژمارەی تایبەتی "ژین"دا بڵاو کراوەتەوە.

سوپاس بۆ یەزدان، یەزدانی گەورە
ئاسۆی هیوای کورد بێ تەم و هەورە
ڕۆژی زانستی بە ڕوونی هەڵات
لەشکری جەهل و تاریکی هەڵات
سەد شوکر میللەت ئێستە هوشیارە
لە ڕێی ژیانا زۆر خەبەردارە
هەموو بۆ بەرزی خاکی نیشتمان
سەر و ماڵی خۆی ئەکا بە قوربان
ئەوانەی هەوڵ ئەدەن بۆ میللەت
یادیان ئەمێنێ بە قەدر و حورمەت
هەر پایەدارن ناویان زیندووە
پیاوی بێ کەڵك پەست و مردووە
گرد بوونەوەمان ئەمڕۆ لەم جێیە
ئیشێکی ئێجگار جوان و بە جێیە
نیشانە و ڕەمزی تێگەیشتنە
بەلگەی بەرزێتی و پێگەیشتنە
هاتووین تەقدیری ئینسانی ئیشکەر
بکەین و قەدری بخەینە سەر سەر
"حاجی تۆفیق بەگ" پیری بە غیرەت
ئەمە بیست ساڵە بە هەوڵ و هیممەت
خەریکە لەگەڵ "ژیان" و "ژین"ا
لەگەڵ ئەدەب و شیعری شیرینا

بــــه نوكتـــــەی جـــوان و ئەشـــــعاری وردی

رەواجــــــی داوە بـــــە نــــــەزمی كـــــوردی

يــــاخوا هــــەر بـــژی پــــيری پـــڕ هونــــەر

بۆمـــــــان ببێتـــــــە دەليـــــــل و رەهبـــــــەر

ئەمــــــــسالّی زۆر بـــــــیٚ لـــــــەناو ولاّتـــــــا

دەســــــتگیرمان بــــیٚ لــــــە رۆی نــــــەجاتا

ئـــــيتر هــــەر بـــژی "ژيـــــن" و "كوردســـــتان"!

هــــەر بـــژی دەســــتەی مــــەعاريف خواهـــــان!

١٩٤٦/٢/٧

# کورد

خـــەیاڵاتی شـــەو و رۆژم ژیـــانی میللـــەتی کـــوردە
تەمـــەننام لای خـــودا دائـــیم ژیـــانی میللـــەتی کـــوردە
بـــە دائـــیم دڵ پەشـــێواوی پەشـــێوی میللـــەتی کـــوردم
وەکـــو بولبـــول ســـەحەرخوانیم ژیـــانی میللـــەتی کـــوردە
نەخۆشـە میللـەت و فـەوتا وەتـەن، بێ هۆشـە ئـەهلی ئـەو
ئـەوەی مەتڵـەب بـێ لامـان هـەر ژیـانی میللـەتی کـوردە
بەڕاســـتی چـــاکترە مـــردن، حـــەیاتی وا لـــەلام تاڵـــە
ئـــەوی نـــاوی نـــەبێ ئـــەمڕۆ ژیـــانی میللـــەتی کـــوردە
شـەجاعەت پیـشەیی کـوردە، مـەعاریف رەسمـی پێـشوویە
کـــەرەم ئەڵبەتـــە بـــاعیس بـــۆ ژیـــانی میللـــەتی کـــوردە
دڵـم خوێنڕێـژ و سـەرگێژە، دو چـاوم پـڕ لـە ئەسـرینە
عیلاجـی دەردی "بێکـەس" هـەر ژیـانی میللـەتی کـوردە

تەشرینی دووهەمی ١٩٤٦

# بیست و حەوت ساڵە

١

بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بەنان و ئاو و جل و بەرگی خۆم
خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم
لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناحەق وا سووکت کردم!؟

٢

بیست و حەوت ساڵە من ئەڕەتێنی
بە فڕوفیشاڵ ئەم خەڵەتێنی
ڕۆژی نەوعێکم هەڵ ئەپەڕێنی
بۆ مەرامی خۆت ملم ئەشکێنی
کە ئیشت نەما وازم لێ دێنی
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

٣

بیست و حەوت ساڵە من تووشی تۆ بووم
لە ڕێی ژیانا هیچ پێش نەکەوتووم
لات و پەژموردەم، هەر وەکو مردووم
قسەی خۆمان بێ حەشرت پێ کردووم
هیوام نەماوە، تازە لە دەست چووم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

٤

بیســـت و حـــــەوت ســــاڵە تاڵـــــە ژیــــانم
لــــە ژێـــــر دەســـــتی تـــــۆ زۆر پەرێــــشانم
لــــە ئینــــسان ناچـــــم، عــــەینی حــــەیوانم
کــــەی رزگـــــار ئـــــەم مــــاڵی وێـــــرانم؟
وا بــــە خـــــۆت ئـــــەڵێیت "حـــــامی"ی گـــــەلانم
گونــــاهم چــــی بــــوو بـــــەم دەردەت بـــــردم!؟
بۆچـــــی بــــە ناهــــــەق وا ســــــووکت کــــــردم!؟

٥

بیـــست و حــــەوت ســـاڵە مـــن بــــە تـــەماتم
چــــاوەڕێی نـــــەختێ لوتــــــف و خـــــەڵاتم
ببووژێنــــــــــــــــەوە خـــــــــــــاکی ولاتم
هـــــیچ گـــــوێ نادەیتـــــــە دەرد و ئـــــــاواتم
چـــــونکە ئـــــەیزانی بــــــێ دەســـــــەڵاتم
گونــــاهم چــــی بــــوو بـــــەم دەردەت بـــــردم!؟
بۆچـــــی بــــە ناهــــــەق وا ســــــووکت کــــــردم!؟

٦

بیــــست و حــــەوت ســـاڵە زووخـــاو ئەنۆشـــــم
لـــــە زوڵــــم و جــــەورت هــــەر چـــاو ئەپۆشــــم
بـــــۆ رەزامەنــــدی تــــــۆ تــــــێ ئەکۆشـــــم
لەبــــــەر تــــــۆ زەربــــــەم داوە لــــــە خۆشــــــم
وا تـــــێ گەیـــــشتم کـــــە چــــەند بـــێ هۆشـــــم
گونــــاهم چــــی بــــوو بـــــەم دەردەت بـــــردم!؟
بۆچـــــی بــــە ناهــــــەق وا ســــــووکت کــــــردم!؟

٧

بیست و حەوت ساڵە تەفرەی خۆم داوە
وازم لە هەموو کەسێك هێناوە
تۆم گرتووە و دنیام خستۆتە لاوە
بۆیە پێم ئەڵێن کەرو ڕێشگاوە
ئەوی تۆی ناسی ملی شکاوە
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

٨

بیست و حەوت ساڵە دەم بە هاوارم
جارێ ناپرسی لە حاڵی زارم
سووتام، پڕووکام زۆر بێ قەرارم
ئەزانی لە تۆ بۆچی بێزارم؟
شارەزای دەردمی، ناکەی تیمارم
گوناهم چی بەم دەردەت بردم !؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

٩

بیست و حەوت ساڵە بە بێ زیاد و کەم
ئەپاڕێمەوە، هەر هاوار ئەکەم
یاخوا کافریش نەبێ بە جەستەم
وێڵ و سەرگەردان بێ تین و خەستەم
هیچم پێ ناکرێ، دیل و دەس بەستەم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

١٠

بیست و حەوت ساڵە دڵم لێت پڕە
ئەحواڵم بە دەس تۆوە زۆر شڕە
سەد بەڵێن بەدەی لەلای من تڕە
بەسیەتی ئیتر ئەم وڕە-وڕە
نۆکەریت ناکەم ورگم هەڵدڕە
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

١١

من رەنجبەرێکم پاک و بەسەزمان
هەوڵم بۆ داوی بە دڵ و بە گیان
بەسیەتی ئیتر درۆ و تەفرەدان
وا ئەبێ عەدڵ و ئینساف و ویجدان
ئەمکەی بە دیلی "......" و ئێران
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم!؟
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم!؟

سلێمانی ١٩٤٦

# قەومی کورد

به بۆنەی هاتنەوەی لاشەی چوار ئەفسەرە قارەمانەکەوە بۆ سلێمانی لە ١٩٤٧دا وتراوە.

قـەومی کـورد ئیـسپاتی کـرد بـۆ عالـەمی سـەر رووی زەمـین
میللـــەتێکی قارەمـــانن هـــەر ئـــەبێ سەربەســـت بـــژین
میللـــەتی لاوی لـــە رێگـــەی ســـەربەخۆیی نیـــشتمان
بێتــە بــەر سـێدارە، بــێترس، دەم بــە خەنــدە و پێکــەنین
قــەومی وا نــامرێ، ئــەژی، بــا دوژمــنی هــەر شــەق بــەرێ
ســاحێبی رۆڵــەی نەبــەردە، خــاوەنی عــەزمی مــەتین
ئــەو کەســەی گیــانی لــە رێگــەی نیــشتمانا بــەخت ئــەکا
پێــی مــەڵێن مــردوو، شــەهیدە وا لــە فیردەوســی بــەرین
لاوی کــورد مــەردە، لــە مــردن قەتعییــەن بــاکی نییــە
پەنــدی پێــشینانە، راســتە "بــەرخی نێــر بــۆ ســەربڕین"
وا وەتــەن دیــسان بــە مــەحزوونی ئــەڵێ ئــەی لاوەکــان
بۆچــی وا مــات و مــەلوولن، بەســیەتی شــین و گــرین
رۆژی تێکۆشـــانە، ســـا دەی هیممـــەتێ تـــاکو زووە
بەشـکو لـەم حالـە نـەجاتمان بـێ و لـە دیلـی دەربـچین....
گەرچـی هەنـدێ کـەس خـەریکن ورگ و گیرفـان پـڕ ئەکـەن
شەو بە بێ خەم سەر ئەنێنە سەر سـەرین، هـەر سەرسـەرین
پیــاو ئــەبێ دائـیم خــەمی قــەوم و وڵاتــی خــۆی هــەبێ
ئەو کەسانەی بـێ خـەمن حاشـا نـەوەی ئـەم خاکـە نـین......

# شیوەن بۆ شەهیدانی ١٩ی حوزەیران

ئەمڕۆکـــــــە ڕۆژی ماتەمـــــــە
عالـــەم دڵـــی پـــڕ لـــە غەمـــە
ڕووی ئاسمــــان هـــەور و تەمـــە
بـــــۆ جوانەمــــەرگانی وەتــــەن

وەتـــەن دەروونـــی لـــەت- لەتـــە
گـــــــیرۆدەی داوی نەگبەتــــــە
خــــەو و خـــــۆراکی میحنەتـــە
بـــــۆ جوانەمــــەرگانی وەتــــەن

"خـــەیرۆڵلا" وتـــی بـە "عیـــززەت"
وا نـــەجاتمان بـــوو لـــە زیللـــەت
بـــا بکەوینـــە کـــەیف و ســـوحبەت
ئێمــــەین شــــەهیدانی وەتــــەن

کوتـــوپڕ "مـــستەفا" و "حەمـــە"
کەوتنــــە بــــەزم و زەمزەمــــە
وتیـــان ســـێدارەش هـــەر کەمـــە
بـــــۆ نــــــەوجوانانی وەتــــەن

ئـــــەوا شــــــەهیدانی وەتــــــەن
گـــشتیان تکاتـــان لـــێ ئەکـــەن
ئـــەڵێن: ژن نـــین، شـــیوەن مەکـــەن
دوژمـــن بـــە خۆتـــان خـــۆش مەکـــەن
هـــەموو بـــە جـــارێ لـــە چـــەپڵە دەن
بـــــۆ جوانەمــــەرگانی وەتــــەن

# داری ئازادی

داری ئـازادی بـه خـوێن ئـاو نـەدریٚ، قـەت بـەر نـاگریٚ
سـەربەخۆیی بـیٚ فیـداکاری ئەبـەد سـەر نـاگریٚ
پیـاو ئـەبیٚ بـۆ سـەندنی حـەقی لـه مـردن سـڵ نـەکا
هـەر "بڕووخـیٚ" بـەس نییـه، تـاکو نەسـەنریٚ نـادریٚ
کـورد ئەگەرچـی موددەتێکـه دیـل و دامـاوە، بـەڵام
بـاوەڕت بـیٚ رۆحـی میللـی هـەر ئـەمێنیٚ نـامریٚ
تـۆ ئەگـەر ئیـسلاحی قـەوم و نیـشتمانی خـۆت ئـەویٚ
لێـت موحەققـەق بـیٚ بـه بـیٚ شـۆڕش مەحاڵـه نـاکریٚ
بـیری ئـازادی جیهـانی گرتـەوە، تـو خـوا بەسـه
ئـەم نیزامـه کۆنـه تـا کـەی؟ هیممـەتیٚ کـەن لابـریٚ
قـەت مـەڵێن دوژمـن بـەهێزه تـۆپ و تـەیارەی هەیـه
ئیتتیفاقتـان گـەر هـەبیٚ زۆر زەحمەتـه خـۆی راگـریٚ
ئەم عێراقه خۆشەویسته خاکی گوڵ گوون بوو به خوێن
تـا حـەقی دەسـگیر نـەبیٚ لـەو خوێنـه دەس هـەڵ ناگریٚ
نێر و مـیٚ هـەر دوو بـه جووتـه بۆ وەتـەن هـەوڵیٚ نـەدەن
دووره دەرچـوونی لـه دیلـی، مـەل بـه باڵـیٚ نـافڕیٚ
هـەوڵی راسـتی هـەر دوو لا ئامـانجی میللـەت سـەر ئـەخا
چونکه مەعلوومـه بـه یـەك دەس چـەپڵه قـەت لـیٚ نـادریٚ
وا گلۆڵـەی کەوتـه لێـژی بـاوی ئیـستیعمار نـەما
هـیچ کەسـیٚ ئـیتر بـه زوڕنـا و تـەپڵی ئـەو هـەڵ ناپـەڕیٚ
دۆسـتی کـورد و عـەرەب زۆر کۆنـه تـەئریخ شـاهیده
ناحـەزی رووڕەش لـه داخـا بـا یەخـەی خـۆی دادڕیٚ

١٩٤٨

# شاخی گۆیژە

وا مەزانە گۆیژە نزمە چونکە تەبعی عالیە
نازری قەسرێکە جێگەی شانشینی والییە
جەننەتی ڕوویی زەمین و وێنەیی باغی بەرین
سۆزە بایێکی هەیە وەك مووس وایە بۆ بڕین
شۆخ و شەن کێوێکە شای کێوانی سەر ڕووی زەمین
گەر کەون مەحبووبەیەك بێ، شاخی گۆیژە خاکییە

بەرزە تەبعی تا بمێنێ تەوقی کەس ناکاتە مل
تووڕەیە، تۆڵە وەسێنە دەردی دڵ ناباتە گڵ
صوبح دەم دەنگی پەشێوە وەك گوڵێ هەستێ لە خەو
چونکە زوڵفی ڕۆژی بەرکەوت ئیتر دەشکێ سامی شەو
بۆت دەکاتە دەشتی مەحشەر دەنگی بولبول دەنگی کەو
ئانی زەردەپەڕ، دەنەخشێنرێ بەخوێنی جوان و دڵ

فەسڵی زستان دای دەپۆشێ بەفری تازە وەك بلوور
مەنع ئەکا وەك شێری بێشە هاتوچۆ کردن، عبوور
ڕەسمی شادیش دەپۆشێ خەرقەیێکی گوڵ گوڵی
گوڵشەنە، گوڵزارە گێرۆدەی هوزارە سەرچڵی
ئاسن ئەتوێنێتەوە ناڵەی حەزین گریەی دڵی
شێت و شەیدایە دەبەنگە، دەشت و سەحرا ماڵییە

جێیەکی پیرۆزە زیاتر جێگەی شێری نەڕە
پڕ لە ئازار لە عاقڵ و دلێر شەڕکەرە
سەنگەری ڕووی دوژمنانە سەختی ڕووی زەحمەتە
بیلخلاسە بۆ ژیانی ئێمە کانی ڕەحمەتە
بێشەی شێری ژیانە قەت مەزانە خاڵییە!!

عەکسی خوێناوی شەهیدانی لەسەر ڕووی زاهیرە
لایەقی تەقدیسە چونکە بێ خەتایە تاهیرە
لایەقی تەقدیرە چونکە فەخری کوردی وا لەسەر
شایەنی ئیعجابە چونکە فەجری کوردی وا لەسەر
ئیحترامی فەرزە چونکە قەبری کوردی وا لەسەر
ئاخیری تۆڵە دەسێنێ شێر لە قەتلا ماهیرە

# مونەووەرانی ئەم زەمانە

وەتـــەن پـــەروەر، مونـــەووەر، حـــالّی حـــازر
کەســـێکە چـــاکەت و پـــانتۆڵ لەبـــەر بـــێ
لەبـــەر ئاوێنـــە خـــۆی رێـــك خـــا وەکـــو ژن
سمێڵـــی پـــاك بتاشـــێ، فـــێس لەســـەر بـــێ
.............[1] وەکـــــــــــو کـــــــــــچ
بـــە باســـتۆن راوەشـــاندن رێ گـــوزەر بـــێ
لـــە فیـــشاڵ کردنـــا بـــێ میـــسل و هـــەمتا
وەکـــوتر بـــێ عەمـــەل، بـــۆ کێـــر ســـوپەر بـــێ
لـــە ئاســـایش وەکـــو شـــێر بـــێ هـــەموو دەم
لـــە رۆژی زەیقـــەتا مـــەخفی نـــەزەر بـــێ
ئەگـــەر ویـــستیان بـــە ریـــز لێـــی دەن بـــە دەســـتە
خەیاڵیـــشیان وەکـــو یـــەك سەربەســـەر بـــێ
ســـەری بـــشوا بـــە قۆڵۆنیـــا و ســـابوون
دەم و چـــاو لـــووس و بـــێتووك وەك فەنـــەر بـــێ
کفـــر کـــا، تـــرِ کـــەنێت و گـــان بـــدا هـــەم
هـــەموو ئیـــشێکی ســـەرتاپا زەرەر بـــێ
بـــە سەرخۆشـــی لـــە مـــاڵان شـــەو بمێنـــێ
هـــەتا رۆژ ســـەد زەبـــەللاحی لەســـەر بـــێ
لـــە گفتوگـــۆ و تەکەللومـــدا وەکـــو گـــورگ
لـــە فـــیعلا زۆر فـــەقیر، هـــەر چەشـــنی کـــەر بـــێ

---

[1] سەرەتای ئەم نیوە بەیتە لە دەستووسەکەی بەردەستماندا سووتابوو.

وەتـــەن پـــەروەر، مونـــەووەر، ئـــەم کەســـانەن
کـــە ســـاحێب فـــەزڵ و پـــڕ عـــەقڵ و هونـــەر بـــێ
بـــە گـــوێرەی وەزعییـــەت، دائـــیم بجووڵـــێ
هـــەموو فیعلێکـــی مـــەقبووڵی بەشـــەر بـــێ
لـــە فیکـــری میللـــەتا بـــێ کـــوللی وەختـــێ
لـــەناو میللـــەت بـــە خزمـــەت موعتەبـــەر بـــێ

## له خوسووسی ئەدەبەوە هوشیاری

ئەو کەسەی فیعلەن بە بەرزی ناوی خۆی ئیزهار ئەکا
حورمەت و شوهرەت بەخۆی هەمڕاز و دۆست و یار ئەکا
هەچ کەسێ ویجدانی پاك و عیززەتی نەفسی ببێ
بۆ حەیاتی مەحوی شێوەی زیللەتی ئیدبار ئەکا[1]
کەسبی حوسنی شوهرەتت بۆ ناکرێ تا سیرەتت
دائیمەن بۆ لە هەوی دنیایی بە دڵ هاوار ئەکا
ئیستیفادەت گەر ببێ بۆ عەهدی جینسی میللەتت
پەیکی بەختت حوڕڕییەت کارانە بۆ خۆی غار ئەکا
گەرچی سوڵتانی زەمین بی، بۆ بەشەر خێرت نەبێ
هەر کەسە بۆ نەفرەتت هەر دەم دەمی ئیحزار ئەکا
چاو لە کەس مەبڕە، بە بێ ئیش خۆت مەکە سەرفی زەمان
چونکە زیللەت وەختی بێکاریت بە تۆ خۆی یار ئەکا
ناوی کەس لای کەس بە بەدناوی مەهێنە سەد دەخیل....[2]

---

[1] ئیدبار: لە دەسنووسەکەی بەردەستماندا نووسراوە "ئەوبار".
[2] لێرە بەولاوەی ئەم پارچە شیعرە لە دەسنووسەکەی بەردەستماندا دڕابوو.

## خود پەسەندان

ئـــەو كەســـانەی ئێـــستەكە دەعـــوایی میللییـــەت ئەكـــەن
نـــاوی خۆیـــان نـــاوە عـــالم، خـــادیمی موڵـــك و وەتـــەن
ئەچـنە چـاخانە بـە كۆمـەڵ لـنگ لەسـەر لـنگ دائـەنێن
فیك و هوورِ دەس پێ ئەكەن، هەم زوڵف و پەرچەم دائەخەن
سـەیری دەمیـان كـەی لەوێـدا چـۆن بـە گـوو دێتـە قـسە
وا دەزانـــن هـــەر یەكـــەی "داروێـــن"ە فكـــری پـــڕ لـــە فـــەن
غـــەیری فیـــشاڵ و درۆ لـــەفزی پـــڕ و پـــووچ و بـــەتاڵ
هیـــچی تـــر نـــازانن ئەســـڵەن، لاف و دەعیـــەش لـــێ ئـــەدەن

## تاك

(١)

ســـــیمام بۆیـــــە وا ماتـــــە و پـــــڕ مەینەتـــــە
كـــورد ســـەر شـــێواوە و كوردســـتان لـــەت لەتـــە[1]

(٢)

هەر زەمانێ قەومی كورد دەرچوو لە زیللەت بوو بە پیاو
جـەژنی مـن ئـەو رۆژەیـە، نـەك جـەژنی قوربـانی و پـلاو

[1] بۆ ژێر وێنەی خۆی داناوە.

# كە پارەت بوو خزم زۆرە

سەرم سووڕماوە نازانم چ شەخسێ بێ غەش و چاکە[1]
لەناو ئەم قەومەدا کێیە لەگەڵ هاوجینسی خۆی پاکە
لە لام وا باشە ئێستاکە بە کەس پشتێ نەبەستی تۆ[2]
لە خزم و دۆست و ئاشنایان هەتا ئەتوانی هەر راکە
ئەگەر پارەت نەبێ بە خوا هەزار خزمت ببێ پەشمە
کە پارەت بوو هەموو عالەم براتە و پێت ئەڵێ کاکە
کەس و کارت وەکو مارن، ئومێدت هیچ نەبێ پێیان
لە ژێر سایەی ئەوان دەرچۆ برادەر خۆتی لێ لاکە
بە رەنجی خۆت لە دنیادا بژی ئازاد و سەربەست بە
هەموو کەس پێت ئەڵێ مەردە و کوڕێکی چوست و چالاکە[3]

سلێمانی ١٩٢٤

---

[1] نازانم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "تێ ناگەم"

[2] تۆ: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەم".

[3] ئازاد و: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەر حوڕڕو" هەموو کەس: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "خەلائیق"

# عەیبە عەیبە

"عەیبە..... عەیبە... " ئەی ڕەفیقان ماڵی خەڵك وێران ئەکا
پیاو ئەخاتە سواڵ و سووکی، گەورە سەرگەردان ئەکا
واسیتەی عەیبە کە دائیم قەومی کورد بێ سەروەتن
بێ مەعاریف، بێ سەنایع تووشی سەد دەردیان ئەکا
سەیر ئەکەی شەخسێکی مەئموور گەر وەزیفەی لێ بڕا
هیچی پێ ناکرێ لەبەر عەیب، ماڵی خۆی تالان ئەکا[1]
عاقیبەت وەختێ کە ماڵی گشت فرۆشت هیچی نەما
ناعیلاجی دێ بە سەریا دەس لە خەڵکی پان ئەکا
یا کەسێکی زۆر بە سەروەت هات و لێی قەوما ئیتر
هەر لە ترسی دەنگی عەیبە تەرکی گشت فرمان ئەکا
حاسڵی بێ کاسبی و کار دائەنیشێ بێ قەدر
بێ مەزییەت خۆی ڕەزیلی خزم و ناو یاران ئەکا
سەیری کە ئەم عەیبە عەیبە چەندە تەئسیری هەیە[2]
کوردی کردۆتە موهاجیر ئیشی ناو شاران ئەکا
چونکە پێی عەیبە لە جێی خۆی ئیش بکا قەدری ئەبەن
بۆیە وا ئەڕواتە غوربەت تەرکی کوردستان ئەکا
بەسیەتی ئەو فکرە پیسە، غەفڵەت و نووستن بەسە[3]
سەیری ئەقوامی غەرب کەن کەشفی ناو ئاسمان ئەکا

سلێمانی ١٩٢٦

[1] تالان: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "وێران".
[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
ئەی برا ئەم لەفزی "عەیبە" هێندە تەئسیری هەیە

[3] پیسە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "قۆڕە".

# داد لە دەست تیاترۆ!

خـەیاڵ و عەشـقی تیـاترۆ، "فـایق"ی کـردووە پەرێـشان[1]
مـەراق و دەردی کـەم بـوو، ئەویـشی هاتـە سەرشـان
جـاران غـەمی ورگـم بـوو، ئێـستا لـەوەش تـرازا
تـالیبی بـەزم و رەزمـم، مـائیلی چـالغی و کـەمان
نـازانم هـەوڵی چـی دەم، هـەوڵی قـووت و ئیـدارە
یـاخود بـۆ پـارەی تیـاترۆ بکەومـە سـاختە لێـدان
حاسـڵی تووشـی داوێ بـووم نییـە رێـی نـەجاتم
دائـیم مـەحزوون و مـوفلیس هەمیـشە مـات و حـەیران
بە رۆژ شان و قۆڵ ئەکوتین، سا هەر چێکمان دەس کـەوێ
شـەوێ تەسـلیم بـە "نۆبـار" ئـەکرێ و ئەیخاتـە گیرفـان
خـۆ ئەوەنـدەش نەگبـەتم هـەر ئەچـمە ریـزی ئـەووەڵ
ئـەڵێم گـۆم هـەتا قـووڵ بـێ مەلـەی خۆشـە بـۆ ئینـسان
بـەو ڕەنگـە مـاڵی بـاوکی خـۆم کـاول کـرد بـە جـارێ
وەهـا پـەڕپووت و لات بـووم بـۆ پـووڵێ ئەچـمە ئاسمـان
خێـرێ کـە ئـەم عالەمـە ئەیدەنـەوە بـۆ "نۆبـار"
بـاوک بـۆ ئـەولادی خـۆی نایداتـەوە بـە یـەزدان
پـارە و پوولـان لـێ بـڕا، کەوتینـە مـاڵ فرۆشـتن
تـەنیا لیفـەمان مـاوە، ئـەویش ئەخرێتـە مەیـدان
کـارێ ئـەم تیاترۆیـە کـردی بـەم ئـەهلی شـارە
بـا بـە دەواری شـڕی ناکـا ئەبـەد رەفیقـان
ئـەڵێن دنیـا ئەمینـە نـەما چـەتە و درۆزن
کەچـی ئێـستاکە زیـاتر چـەتە کەوتۆتـە ناومـان

---

[1] فایق: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "بێکەس".

فــەرقی "نۆبــار" و چــەتە ئــەبێ چــی بــێ بــرادەر؟
ئــەوی کــە "نۆبــار" ئــەیکا، نایکــا چــەتەی بەســەزمان
ســیرڕێکی زۆر عەجیبــە گــەر تــێ فکــری بــە دیققــەت
مــــەحوی ولاتـــت ئەکـــەن هێـــشتا مــــەمنوونی لێیـــان
خۆلاســـــە کـــــەس نـــــەماوە تـــــۆپی ئـــــاگر نـــــەدابێ
مــەئموور: قــەرزار و مــوفلیس، کاســب: حــەزین و گریــان
خــوا نەخواســتە وەزعییــەت بــەم نەوعــە بــێ هــەتا ســەر
هــەموو لەبــەر بــێ نــانی بــۆ ســوالّ ئەچــینە شــاران
هـــــەتا زووە عیلاجــــێ ئەمانـــــە لێــــرە دەرکــــــەن
وابـــێ بەرگـــە نـــاگرین، ئـــیتر ویجـــدانی خۆتـــان!....

سلێمانی ۱۹۳۷

# تیاترۆ ببێ چاترە

خەڵقە، نەمزانی زۆر پەشیمانم
هەجوی تیاترۆم کرد، لاڵ بێ زمانم
دەستی شکاوم بۆ ئەو زەمانە
کە "نۆبار" ئیشی ئەکرد لێرانە[1]
زەمانێکی زۆر خۆش بوو برادەر
کاشکی هەر لێرا بوونایە تا سەر
لەوساو رۆیشتوون زۆر بێ قەرارم
هەمیشە مات و پەست و غەمبارم
ئێستا کە شەوێ بوو بە سەعات سێ
بۆ دەرمان لە دەر نابینی کەسێ
خواه و ناخواهی ئەم خەڵقە بە زۆر
ئەچنە ماڵەوە بۆ ژێر لێفە بۆر
سەیری شار بکەی کە چەند تاریکە
بێ زەوق و بێدەنگ بێ ئەلکتریکە
هەروا ئەزانی کە قەبرستانە
یا چەشنی بابل هەمووی وێرانە[2]
بەڵام کاکی خۆم بە تاریکە شەو
شتی وا ئەکرێ نەبینرێ بە خەو
هەندێ شت هەیە با تۆش بیزانی
ئەیڵێم با لە کەس نەبێ پەنهانی

---

[1] کە نۆبار ئیشی ئەکرد: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە گکە تیاترۆ یاریی ئەکرد."
[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
یاخود شارێکی کۆنی وێرانە.

چەند کەسانێ هەن لە گەنجی وەتەن
کە شەویان لێ هات هەر قومار ئەکەن
هەر شەوەی ئەچنە ماڵی یەکێکیان
خەریکی یارین تا بەری بەیان،
نۆتی تازە و کۆن دێتە فڕك و هووڕ
کۆڕیان گەرم ئەبێ هەر وەکو تەنوور
پارە دائەنرێ ئەوسا بە تەغار
روپیەی تیا ئەڕوا لە سەد تا هەزار[1]
سەیرە، هەرایە، روپیە برانە
بگرە و بەردەیە، سوێن و قورئانە
ئەو ئەڵێ بەخوا نایدەم هی منە
ئەم ئەڵێ رابوورد، دەستت بەم گونە[2]
لە پاشا لێیان ئەبێتە هەرا
کاتێ ئەزانی یاری تێك درا
ئەمجار ئەوانەی ئەکەونە لاتی
لێی پاڵ ئەکەون لەوێ بە ماتی
هەناسەی ساردیان دەردێ لە دەروون
ئینسان لە تاوا بۆی ئەبێ مەحزوون
بەڵام غاڵبەکان شاد و مەسروورن
سەربەرز و قنج و قیت و رووسوورن
دەنگی پێکەنین ئەڕوا دە قۆناخ
ئەگەشێنەوە هەر وەك گوڵە باخ[3]

---

[1] ئەم بەیتە لە چاپی پێشوودا نییە.
[2] ئەم بەیتەش هەروا لە چاپی پێشوودا نییە.
[3] ئەم بەیتە و سێ بەیتی پێشەوەی لە چاپی پێشوودا نین.

ئـــەنجا وەك تـــەڕاح رائەكێـــشن ئـــەنوون[1]
دەســـتەیەك دڵـشاد، دەســـتەیەك مـــەحزوون
بــــەو ڕەنگـــە خۆیـــان پەرێـــشان ئەكـــەن
كاســـبی و تێكۆشـــین بـــۆ شـــەیتان ئەكـــەن
ئـــــەوقاتی خۆیـــــان وا رائــــــەبوێرن
مـــانگ بـــە دەقیقـــە و ســـەعات ئـــەژمێرن
مـــانگ زۆر درێـــژە بـــۆ پیـــاوی نـــابووت
تـــا مـــەعاش ئـــەدرێ رۆح دێتـــە ســـەر لـــووت
ناچـــار ئەفەنـــدی بـــۆ قومـــاری شـــەو
پـــارە قـــەرز ئـــەكا دائـــیم لـــەم و لـــەو
مەعاشـــــی هـــــەموو ســـــەراپا قـــــەرزە
دانـــەوەی قـــەرزیش دیـــارە كـــە فـــەرزە
هـــەروا تـــا ئـــەمرێ دوانـــزە مانگـــەی ســـاڵ
موحتـــاج و لاتـــە لـــە حاڵـــەتی ســـواڵ
گیرفـــانی ســـــووك و پـــــاك و تـــــەمیزە
قـــەرزار و مـــوفلیس ســـووك و ســـەرحیزە
ئـــــەمجا بـــــا باســـــی نەخوێنـــــدەواران
نـــەختێ بـــە كـــورتی بكـــەم بـــۆ یـــاران
ئـــەوانیش هـــەموو بـــە شـــەو سەرخۆشـــن
لاكـــەی ســـەریان دێ مەســـت و بـــێ هۆشـــن
دەســــــوورێنەوە تــــــا رۆژ وەكــــــو مـــــار
بــــە دوای هـــــەتیو و عـــــارەق و قومــــار[2]

[1] وەك تەڕاح: لە هەندێ نوسخە و لە چاپی پێشوودا نووسراوە "خەویان دێ". ئێمە لێردا بە پێی ئەو دەسنووسە نووسیمانەوە كە بەیتە زیادەكانی تیابوو، چونكە وا لە بارتر و گونجاوتر بوو.
[2] ئەم بەیتە و سێ بەیتی پێشەوەی لە چاپی پێشوودا نین.

خۆلاسە تیاترۆ کە سەفەری کرد
ئەم شارە بە خوا زۆر زەرەری کرد
گەر تیاترۆ بێ ئەحوالْ ناگۆڕێ
پارە بە یاری هێندە نادۆڕێ
بە میقداریکی زۆر هەرزان و کەم
ئینسان کەیف ئەکا و دەرئەچێ لە غەم[1]
خراپ گەیشتم لە ئەوەڵی ئیش
سمێڵم دانا لە پێناوی ریش
ئەموت واسیتەی لاتی ئەم شارە
بێ شك تاقم و جۆقەی "نۆبار"ە[2]
ئاخری رۆیین بۆیان چۆڵ کردین
ئەگەرچی نەختێ پارەشیان بردین
دوارۆژم ئەوەندە خراپ دێتە بەرچاو
فرمێسك بۆ جاران ئەرێژم وەك ئاو
ئەگەر هاتنەوە ماوەیان بدەن
خێرتان ئەنووسرێ با یاری بکەن
میسالێکە زۆر نایاب و فەسیح
وتراوە دەفعێ ئەقبەح بە قەبیح!....

سلێمانی

---

[1] نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە چاپی پێشوودا بەمجۆرە بوو:
ئینسان خۆی رزگار ئەکا لە دەس غەم
[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
بەزیم تیاترۆیە نەیهێشتووە پارە

# به بۆنەی دانانی یانەی فەرمانبەرانی هەولێرەوە

به نووری عەدل و ئاسایش مونەووەر بوو هەموو هەولێر
لە ژێر کابووسی غەم دەرچوو خەلایق شاد و خەندانە
تولووعی فەیز بەخشی تۆ شەوی دەیجووری والا کرد
لە هەر لایەك تەماشاکەی جولووس و بەزم و سەیرانە
لە سایەی هیممەت و لوتفی.......ی عەدالەت خوا
وەکو فیردەوسە ئەم شارە بە دایم روو لە عیمرانە
چراغی فیکری رووناکی لە هەر شوێنێ کە داگیرسا
شەوی تاریکی وەك رۆژە، خەراباتی گوڵستانە
بە تەئسیس و بناغەی ئەم بینایە عەرزی تەبشیری
هەموو مەئموور ئەکەم ئیتر نەجاتی بوو لە چاخانە
مەحەللی ئیجتماعی وا هەتا ئێستا نەبوو لێرە
زەمانی غەدر و وەحشەت بوو تفوو لەو رۆژو دەورانە
لە سایەی خواوە خورشیدی سەعادەت وا لە کەل دەرکەوت
بوخار و هەوری میحنەت رۆی، زیایی میهری تابانە
دەوامی "بانگی یاری"[1] بۆ ئەهالی فەرز و پێویستە
کە یاری و خزمەتی ئێرە لەسەر شانی هەموومانە
ئومێدم لای خودا وایە کە ئەشرافی هەموو هەولێر
لە بەرزیدا بژین تا سەر لەگەڵ ئەم قەومی کوردانە

هەولێر ١٩٢٨

---

[1] مەبەستی یانەی یارییە.

# هەوڵ و تێکۆشین

رۆژو ئەرزو مانگ وا لە گەڕایە
تۆش تێ بکۆشە تا هێزت تیایە
ئینسانی ئیشکەر حەبیبی خوایە
بە کەم رازی بیت زۆر لە رێ دایە
سەری بێ رۆژی لە ژێر خاکایە

کاکە دانیشتن ماڵ وێران ئەکا
بێ ئیشی ئینسان پەرێشان ئەکا
نەفرەت لە خۆی و لە ژیان ئەکا
نان و ماق تۆ هەر لە کارایە
سەری بێ رۆژی لە ژێر خاکایە
بە پێی فەرموودەی ئایەتی قورئان
لە سەعی زیاتر نییە بۆ ئینسان
هەوڵ و تێکۆشین فەرزە بۆ ژیان
نابێ مەئیووس بی تۆ لەم دنیایە
سەری بێ رۆژی لە ژێر خاکایە

مەڵێ فەقیرم، کوفری نیعمەتە
لەشی ساغ بۆ تۆ موڵک و سەروەتە
پیاوی تەوەزەل لات و نەگبەتە
قۆڵی لێ هەڵکە بچوورە کایە
سەری بێ رۆژی لە ژێر خاکایە....

سلێمانی ٣/١١/١٩٣٩

# خوا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

بڵێم چی لەگەڵ چەرخی ئەفلاکا
سەیری کە چۆن چووین بە ناخی خاکا
وا چاکە ئینسان لەم باسە راکا
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

ئەگەرچی ئێمە قەومێکی زۆرین
بەڵام داخەکەم چەوت و خۆخۆرین
بۆیە وا لە ژێر چەپۆك و زۆرین
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

بۆ کوشتنی یەك گورج و بەکارین
رۆژێ دەسمان بێ بڵح و زۆردارین
لە پێویستی دا وەك ژن هەژارین
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

ئەزانی بۆچی وا کورد زەلیلە
بێ ناو و نیشان هەمیشە دیلە
چونکە دوودڵ و خام و بەخیلە
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

لــەم عەســرە كــەوا عەســری بیــستەمە
هــــەموو میللــــەتێ خــــاوەنی حوكمــــە
هــەر كــوردی نەگبــەت وا لــە ژێــر غەمــە
كاكــــە خـــوا ئیـــشی نابـــەجێ ناكـــا
تــا كێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناكــا

مونــــەووەر زۆری هــــەر لەبــــەر نــــانی
وەتــــەن ئەفرۆشــــێ بــــە یــــەك تــــارانی
ئەخاتــــە ژێــــر پــــێ دیــــن و ئیمــــانی
كاكــــە خـــوا ئیـــشی نابـــەجێ ناكـــا
تــا كێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناكــا

ئەشــــرافمان هــــەموو بــــێ رۆح و ســــستن
دەخیلــە پــشتیان هــیچ پــێ نەبەســتن
هــــەموو نــــاكۆك و پــــارە پەرســــتن
كاكــــە خـــوا ئیـــشی نابـــەجێ ناكـــا
تــا كێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناكــا

قــەومێ ســەوییەی ئەگــەر ئــاوا بــێ
مەحاڵــە خــاكی بــەرز و ئــاوا بــێ
بــۆ مــردن باشــە تــەفر و توونــا بــێ
كاكــــە خـــوا ئیـــشی نابـــەجێ ناكـــا
تــا كێــو نــەبینێ بــەفری تــێ ناكــا

ئەمڕۆ بە بێ شك لە ناو عالەما
هیچ قەومێ وەك كورد وا بە جێ نەما
ناوی لە ناو خانەی عەدەما
كاكە خوا ئیشی نابەجێ ناكا
تا كێو نەبینێ بەفری تێ ناكا

ئێمە كوژراوی دەستی نیفاقین
موحتاجی پارە و عیلم و ئەخلاقین
بۆیە وا پەستین، بێ ئیتتیفاقین
كاكە خوا ئیشی نابەجێ ناكا
تا كێو نەبینێ بەفری تێ ناكا

سلێمانی ١٩٢٩/١١/١٦

# نەسرین

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە[1]
وا من پێت ئەڵێم چونکە لە سەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

مەڵێ من کچم، تۆش وەکو منی
موحتاجی عیلم و فەن و خوێندنی
مەجبووری ئیش و خزمەت کردنی
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

هێندە دانیشتی پشتت چەماوە
زەرد و لاواز بوویت هێزت نەماوە
کچی بێگانەت خۆ لە بەرچاوە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

---

[1] گیرۆدەی بەندی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "حوقووقت غەسبە".

خــــشڵ و جــوانی تــۆ حـــەیا و فێربوونـــە[1]
پاشەرۆژیـــــشت هـــــەر بـــــەوان روونـــــە
کـــچی بـــێ عـــیلم دیـــل و زەبوونـــــە
هەســـــتە تێکۆشـــــە تـــــا خوێنـــــت گەرمـــــە
ســـــەرپۆش فـــــڕێ دە چ وادەی شـــــەرمە

وەك خوشـــك و بـــرا ئـــەبێ هـــەر دووکمـــان
قـــۆڵی لـــێ هەڵکـــەین بـــچینە مەیـــدان
تـــا کـــورد بەرینـــــە ریـــــزی میللـــەتان
هەســـــتە تێکۆشـــــە تـــــا خوێنـــــت گەرمـــــە
ســـــەرپۆش فـــــڕێ دە چ وادەی شـــــەرمە

سلێمانی ١٩٤٤

---

[1] حەیا و فێربوونە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەر بە فێربوونە".
لەمەڕ مێژووی دانانی ئەم پارچە شیعرەوە مامۆستا کەریم شارەزا نووسیویە ئەڵێ: لە یادمە لە پایزی ١٩٤١دا قوتابی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، مامۆستای زمانی کوردی ئەم پارچە شیعرەی پێ لەبەر کردبووین. "بڕوانەرە: کەریم شارەزا، سەرچاوەی پێشوو."

# فیز و لەخۆبایی بوون

عومرێکی توڕڕەهاتە
بێکەڵك و بێ سەباتە[1]
ئاخری قەبری تەنگە
ئەوی کە لۆرت و لاتە

دنیایەکی بەڵایە
پڕ دەرد و پڕ جەفایە
هانایە پێوە بایی
مەبن، بە خوا خەتایە[2]

نە مووسایی پێغەمبەر
دەوامی بوو هەتا سەر
نە دارا و نە ئەسکەندەر
نە تەخت و بەختی قەیسەر[3]

خەوێکی کورت و تاڵە
بێ فائیدە و بەتاڵە
شریتی سینەمایە
کاکە هەر وەك خەیاڵە

[1] ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
ئەم حەیاتە مەماتە
وەڵلاهی بێ سەباتە
[2] هانایە پێوە بایی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "دەخیلە پێوەی مەغروور".
[3] ئەم کۆپلەیە لە چاپی پێشوودا نییە.

چەند خانەدان بەسەرچوو
چەند نازەنینی خۆش ڕوو
لە ژێر ئەم خاکە بوونە
خۆراکی مار و مێروو

بۆ وا بە لار و لەنجە
ئەڕۆی بە نووکی پەنجە
تێ بفکرە لە ژێر پێت
هەر گۆڕی پێی گەنجە[١]

زۆر عەیبە دەعیە لێدان
بەسەر ئێسقانی ئینسان
گەر ئەتوانی بە دەعیە
بفڕە بچۆرە ئاسمان.....

[١] هەر گۆڕی پێی گەنجە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەر قەبری پیر و گەنجە".

# قومار

وا سلێمانی گشت ئینتیزامی[1]
هاتە سەر یاریی "پۆکەر" و "رامی"
بڵاو بۆتەوە لەناو خاس و عام
"جۆکەر"یان کردە ویردی سوبح و شام
گەر بێ خەبەری لەم ئەحوالانە
شەوێ بچۆرە ئەو چاخانانە
ئەوسا ئەبینی لە هەموو لایەك
هەر چەند کەسێکە و چۆتە پەنایەك[2]
دەوری قاقەزیان داوە و دانیشتوون
بۆ وەسڵی جۆکەر شێت و شەیدا بوون
خەریکی یارین هۆشیان نەماوە
ملیان کووڕ بووە و پشتیان چەماوە
هەر تەق و هووڕ و هەرا هەرایە[3]
سەیرێکی خۆشە وەك سینەمایە
بەڵێ دریغا ئەم قەومی کوردە
بۆ شتی بێ فەڕ بە دەست و بردە
نیفاق و درۆ و جاسووسی و قومار
تێیا ماهیرن وەکو دانی مار

---

[1] سلێمانی : لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "شارەکەمان".

[2] نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەمجۆرەیە:
هەروا چەند کەسێك چوونە پەنایەك

[3] نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
هەر زرم و هووڕ و هەرا و هورایە

ئەمجا با بێینە سەری یاری کەران
هەر دەستە بە جیا بۆت ئەکەم بەیان
تاقمی مەئموور سدارە بە سەر
لێی تێکەڵاو بوون وەك چێشتی سواڵکەر
یەکێ مودیرە، یەکێ موحاسیب
یەکێ موعەللیم، یەکێ باش کاتیب
ئامیر لەوێ دا وەکوو مەئموورە
کۆڕیان گەرم ئەبێ بە وێنەی کوورە
لە ئەوەڵی مانگ تا پێنج و شەشی
لەسەر پارەی زۆر ئەکرێ دوو بەشی
بەڵام کە وەختێ مانگ هەشت و نۆی بێ
کیسەی چۆڵ ئەبێ هەر خۆی بە خۆی بێ
پارە قەرز ئەکا دائیم لەم و لەو
لەبەر قەرزاری هیچ نانوێ بە شەو[1]
گیرفانی سووك و پاك و تەمیزە
قەرزار و موفلیس پەست و سەرحیزە[2]
ئەمە کردەوەی لاوەکانمانە
کەوا کوردستان چاوی لەوانە[3]

---

[1] لە هەندێ نوسخەدا ئەم بەیتە بەم جۆردیە:
پارە ئەسێنێ بە قەرز لەم و لەو
کە هات دۆڕاندی خۆ نانوێ بە شەو
[2] ئەم بەیتە لە پارچە شیعری "تیاترۆ ببێ چاترە"شدا هەبوو.
[3] کەوا کوردستان: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "کە موڵك و میللەت"

تـــــاقمێکی تـــــر ئـــــەویش توجـــــاڕە

یـــــاخود کەســـــەبە و ئـــــەهلی بـــــازاڕە[1]

بـە ڕۆژ هــەوڵ ئــەدەن بــەو حاڵــە پیــسە

بـــە هــەزار حـــاڵ و ســـوێند و دەسیـــسە

دەســـتی خـــەڵق ئـــەبڕن شـــتێ ئەفرۆشـــن

شـــەویش بـــۆ یـــاری وەهـــا بـــە جۆشـــن

لێکـــــی بـــــەرەوە چـــــاکی بزانـــــە

ئەمـــــە ئـــــەحواڵی موجتەمەعمانـــــە

مـــن مـــەنعی یـــاری ناکـــەم بـــە کـــوللی

بـــا بکـــرێ، ئـــەمما بـــە موعتـــەدیلی

ئێمـــە قـــەومێکین وا لـــە ژێـــر بـــارین

حەیفـــە ئەمەنـــدە خـــەریکی یـــارین

بـا جـارێ خۆمـان دەرکـەین لـە زیللـەت

ئەوســـا دەس دەینـــە قومـــار و عوشـــرەت

سلێمانی

---

[1] ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:

تاقمێکی تر ناویان توجاڕە        یەعنی کاسب و ئەهلی بازاڕە

# ئاواتی دڵ

دڵ کە زۆر مەسرووورە ئەمڕۆ، ئارەزووی ئیزهار ئەکا
حەز لە فنجانی شەرابی دەست و پەنجەی یار ئەکا
دڵ گەشە، وەك گوڵ وەهایە، دەرد و ئازاری نەما
تالیبی وێسکی و شەرابە، حەز لە عوود و تار ئەکا
دڵ نەجاتی بوو لە تەنگی کەوتە بەزم و رەزمەوە
عاشقی سەیر و سەفایە، مەیلی ناو گوڵزار ئەکا
دڵ ئەوەندە مەست و کەیلە، شێتە، هیچ هۆشی نییە
وا لە رەقسایە خەریکە عالەمێ بێزار ئەکا
دڵ بە نەشئە و بەزمی میللییەت شوکر بووژایەوە
شایی یە، سەیرانە، بەزمە، پڕ بە دەم هاوار ئەکا
دڵ بە ئاواتی گەیشت و لاوی کوردی دی کەوا
یەك دڵ و یەك دەم خەریکە میللەتی هوشیار ئەکا
دڵ لە کینە خاڵییە، بێ گەردە، سافە وەك بلوور
سەد تف و لەعنەت لە چارەی خائینی سەگسار ئەکا
دڵ ئەڵێ "بێکەس" هەتا کەی لاف میللییەت بە دەم
هەوڵ و تێکۆشینە تەنها قەومی کورد رزگار ئەکا
گەر بەڕاستی بێنە پێشێ، دەس لە دەس یەك کەن هەموو
کێیە ئەوسایە حوقووقی قەومی کورد ئینکار ئەکا؟!
یەکتریتان خۆش بوێ تا نەگبەتی بەرتان بدا
دوودڵی ئەم قەومە دیل و سووك و بەدرەفتار ئەکا....

# شێخەکان

شێخ کە دەف لێ دەن وەکوو "........" لە زیکرا هەڵپەڕێ
حەقیـەتی دەروێـشی مـسکین نـاعیلاج گـەر هـەڵتڕێ
شـێخ لەبـەر چـاوی مریـدا خـۆی بـە جیبریـل دائـەنێ
"بالتبع" هەر شەخسی جاهیل زوو بە زوو بۆی دێتە ڕێ
شـێخ لەبـەر تـەئمینی قـووتی ڕێـی حەقیقـەت لائـەدا
........دنیـای چ باسـە، یـاخۆ دیـنی وەرگـەڕێ[1]
شـێخ خـیلافی ئـەمری بـاری هەرچـی فیعلێکـی هەیـە
گـشتی بـۆ تەحـسیلی پـارە تـا لـە خـەڵقی وەرگـرێ
کەی خودا فەرمووی کە وەك گا بۆڕە بۆڕ دەست پێ بکەی
ورگی خۆت رووت کەی بە شمـشێر لێـی بـدەی تـا هەڵدڕێ
سەد ئەسەف بۆ دینی ئیسلام چەند پەرێشان بوو لە دەس
شـێخ و دەروێـش و مـەلای..... خوایـە ئەمـسالیان بـڕێ

[1] ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە چاپی پێشوودا نین.

# ئەی مەلا

ئــەی مــەلا دیــارە خــەریکی فیتنەیــەك بــەرپا ئەکــەی
دەوری پاپــا و عەســری ئیرهــاب لێــرەدا ئیحیــا ئەکــەی
تــۆ کــە هــیچ کــەڵکت نــەبێ غــەیرەز ســوواڵ و تەمبــەڵی
ئێــستە وا هــار بــووی لەبەرچــی پــێم بڵــێ بــۆ وا ئەکــەی؟!
تــۆ لــە بــاتی وەعــز و ئیرشــاد و نەســیحەت کــەی، کەچــی
بوویتــە شــەیتانی عــەوام و جــاهیلان ئیغــوا ئەکــەی
گــا بــە نووســینی مــەزابیت، گــەه بــە تــەحریکاتی خــەڵك
بــۆ ڕەزای شەخــسێ هــەزاران ئیــشی بــێ مــەعنا ئەکــەی
ئالــەتی دەســتت، کــە کــز بــووی، دینــە تــەنها بــوو ســوواڵ
ڕۆژێ دەست داریش سیلاحتە و خەڵقی پێ ئیمحا ئەکەی
نـــووری ئـــازادی جیهـــانی گرتـــەوە، وا تـــازە تـــۆ
مەحکەمەی تەفتیشی نەگبەت سەر لە نـوێ ئینـشا ئەکەی
واز لــە عالــەم بێنــە، دانیــشە، بــەرۆکمان بــەر بــدە
مەلعەنــەت بەسیە هــەتا کــەی خــۆت وەهــا ریــسوا ئەکــەی
مــن ئــەزانم تــۆ بــە فــیتی کێیــە کەوتوویتــە ســەما
سەگ کە هار بوو چل شــەوی عــومرە ئەگــەر بــڕوا ئەکــەی

# ئاخ مەلا......

هەر دوو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعز و سەرفیترە و زەکات
هەر هەواڵی حەشر و نەشرم پێ ئەڵێی تاکوو مەمات
بەسیە لەم مەوزووعە لادە فێری نوێژ بوو کائینات
خوتبەیەکی ئیجتماعیم پێ بڵێ بۆ رێی حەیات
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
فەننی تازەم پێ نیشان دە بۆ تەرەققی و رێی نەجات

"اطلبوا العلم و لو بالصين" گەر تێبگەی تەمام
قەتعییەن تەحسیلی فەنن و مەعریفەت ناکەی حەرام
فائیدەی چی "قام زید"، کەڵکی چی دێ؟ پەشمە لام
عالەمت کەر کرد مەلا خوا لێت بسێنێ ئینتیقام
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
تۆی بەڕاستی مانیعی بەرزی و تەرەققی و ئینتیزام

چاو لە دەقنە و نانی راتوو مەبڕە دائیم مل قەوی
خوا بەڵات لێ دا هەتا کەی وا لە خۆراك و خەوی
تەمبەڵی، مردووت مرێ، بەسیە لە کن خۆت پێشڕەوی
هەستە تەشویقێ بکە بۆ ئیشی دینی و دونیەوی
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
واسیتەی تۆیە کە دینی بەرزی ئیسلام بوو نەوی

هەر کەسێ هەستا و بە ساختە مێزەرەی نایە سەری
عالمە و مەسمووعە قەولی گەرچی کەر بێ و سەرسەری
حاسڵی خەڵقی ئەبێتە نۆکەر و عەبد و کەری
ماڵی ئیسلامی بە قورِ گرت و لە دین کردی بەری
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
خائینی گەر وا دەوام کەی، رووسیاهی مەحشەری

ئەوروپا پاپای تەمێ کرد، دەستی دایە عیلم و فەن
بێ تەل و کەشتی دروست کرد، دائیمی هەر هەوڵ ئەدەن[1]
قەومی ئیسلامیش مەلا گەر بێتو زوو ئیسڵاح نەکەن
دائیمەن مەحکوومی جەهلن، سووك و ریسوا و ناپەسەن
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
باسی قەبر و مار بگۆرِە، بێرە سەر باسی وەتەن

خوایە یەك "لووتەر" بنێری بۆ گەلی کوردی فەقیر
با نەجاتی دا لە ژێر دەستی مەلا و شێخان و پیر
ئەم شەوی دەیجووره تا کەی؟ دەرکەوێ رۆژی مونیر
"........"ش وا بوونە حاکم، ئێمە هەر دیل و ئەسیر[2]
ئەی مەلا تۆ بی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
باسی باوەرِ کە نەماوە باسی فیردەوس و سەعیر

سلێمانی

[1] دائیمی هەر هەوڵ ئەدەن: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "تۆپ و تەییارە و تفەن".
[2] وا بوونە حاکم..... تاد: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "وا بوونە شت، هەر کوردە گەر مابێ ئەسیر."

# مەلا و شێخەکان

لای مەلا وایە کە جەننەت تەکیە و لات خانەیە[1]
جێی مورید و شێخ و سۆفی، مەلجەئی دێوانەیە
غەیری ئەم قسمانە باقی کافری بتخانەیە
موختەریع، عالم، مونەووەر پەشمە لای، ئەفسانەیە

شێخ ئەگەر سەد کەس بە خەنجەر لەت بکا بەئسی نییە
"....." بکا، تالآن بکا، کوشتار بکا ترسی نییە
چونکە ئەولادی رەسووڵە قەتعییەن پرسی نییە
خائین و بێدین لە کن ئەو عاشقی پەیمانەیە

مامە سۆفی وای تەمایە هەر بە ریشی پانەوە
قەسری بۆ حازر کرابێ پڕ بە حۆری جوانەوە
ئەو ئەڵێ جەننەت بە ریشە، نەك بە هۆی عیرفانەوە[2]
سەد "صلاح الدین" و "دارا" قیمەتی یەك ئانەیە

گەر بەهەشت هەر بێتە جێگەی جاهیل و شێت و کەران
دۆزەخیش مەخسووسی پیاوی فازیل و ساحێب نیشان
خوایە بمخەیتە جەهەننەم نەچمە ریزی وەحشییان
جەننەتی چی گەر وەها بێ عەینی تیمارخانەیە

---

[1] مەلا: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "گەلێ".
[2] نەك بە هۆی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "چی بەسەر"

چـاوەکەم بــە خــوا خــەیاڵتان خــاوە چــاکی تێبگــەن
خوا یـەکێکی خـۆش ئـەوێ دانـا بـێ سـاحێب فیکـر و فـەن[1]
ئیـستیفادەی بـۆ بەشــەر بــێ، خــادیمی موڵــك و وەتــەن
هــای و هــوویی بــێ ســەمەر هــەر کــردەوەی شــێتانەیە

سلێمانی

[1] فیکرو: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "عیلم و "

## باسی ڕەمەزان

خەڵقــه پــێم بڵــێن کــه چــی قــەوماوه؟
ئـــەم خەڵقـــه بۆچـــی ئـــەڕۆن ڕۆژاوه؟[1]
هــەر غەڵبەغــەڵبی خەڵقــه و تــێ ناگــەم
هــەر ئــەڵێن هــەوره و فــەرقی پــێ ناگــەم
یــەکێ هــات وتــی چــۆن تــۆ نــایزانی
لــه ســایەی خــواوه خــۆ موســوڵمانی
ئـــەمڕۆ ســـی و یەکـــه وا ڕەمەزانـــه
مـــانگێکی گـــەورەی موســـوڵمانانه
ئـــەم خەڵقـــه بۆیـــه گـــردن لێرانـــه
بـــزانن دیـــاره مـــانگ یـــا پەنهانـــه
خـــۆم پـــێ نـــەگیرا زوبـــانم نەســـرەوت
وتم ئــەی هــاوڕێ ئــەوا نــاوکم کــەوت
خـــوا بتـــانگرێ بـــۆچ منتـــان تۆقـــان
بـــۆچ لــەم کاتــەدا لــێم بــوون بــه شــەیتان
حاســـــڵی لـــــێم دا چـــــوومه ماڵـــــەوه
بـــــه دڵێکـــــی زۆر پـــــڕ خەیاڵـــــەوه
هێنــدەی پــێ نەچــوو زرمــەی تــۆپ هەڵــسا
عالـــەم لـــه دەنـــگ و ناڵـــەی ئـــەو ترســـا
هــەرا پــەیا بــوو لــه نــاو خــاس و عــام
ڕێ بـــەر نەئەکـــەوت لەبـــەر ئیزدیحـــام
خوایــه کــەرەمت هــەر بــۆ مــن غەمــه
ســەد شــوکر خوایــه مــن ڕازیــم بەمــه

---

[1] نیوەی دووهەمی ئەم بەیته له هەندێ نوسخەدا بەمجۆرەیه:
لەبەرچی زەمین وا خرۆشاوه

خۆ داخی رۆژوو هێندە گرانە
لەسەر دڵی من ئەڵێی باتمانە
تووشی گوون ڕەشی خۆم ئەوا هاتم
نازانم چی بکەم، کوا رێی نەجاتم
بە رۆژ بەڕۆژوو گێژو بێ هۆشم
لاکەی سەرم دێ چەشنی سەرخۆشم
ئەوقاتم لەبەر بێ هێزی وەك تەر
دەڕوات و کەوتووم وەك ئێشکی کەر[1]
دەی چاوەڕوان بە تا وەختی ئیفتار
سەیری سەعات کە و بکە ئینتیزار
کاتێ ئەزانی تۆپ ئاگر درا
ناوساجی و شفته و ماستاو دانرا
بەڵام پێم بڵێن هەی داد و بێداد
بۆچی پێم ناخورێ لە دوو پاروو زیاد
خۆ لە پێش تۆپدا من لە دڵی خۆم
ئەموت قەت مومکین نییە تێر بخۆم
کەچی کە وەختی هاتمە سەر سینی
ئەوە خواردنمە کەوا ئەیبینی
لە دوای نان خواردن نۆرەی گەڕانە
یان چاخانەیە، یان دیوەخانە
چاخانەش هەر وەك حەمامی ژنان
دەنگ و قیژەیان ئەگاتە ئاسمان
لە شەق و هووری دۆمینە و قومار
ئینسان لە ژینی خۆی ئەبێ بێزار

---

[1] ئەم بەیتە لە چاپی پێشوودا نییە.

ئەمجا بام سەرێ لە دیوەخان دەین
بزانین چییە و هەواڵ تێ بگەین
ئەگەر هەواڵی ئەوێش ئەپرسی
هیچ نییە غەیرەز باسی مەبعووسی[1]
یەکێکیان ئەڵێ فلان کەس باشە
ئەوی تر ئەڵێ ئەحمەق و جاشە
کۆمەڵێکی زۆر بێ زەوق و سروور
دایم هەرایە پڕ لە گرم هووڕ
ئەوا بەم حاڵە شەویشمان رابوورد
چووینە ماڵەوە پارشێویشمان کرد
هیچی تر نەما جا نۆرەی خەوە
بەسەر خواردنا وەرە پاڵ کەوە
کە نیوەڕۆ بوو عالەم هەستاوە
دەم وشك و بۆگەن چاویان ئاوساوە
دەروونیان گەرمە هەر وەك ئاگرن
دایم بۆ شەڕ و هەرا حازرن
لە جێی رۆژباش و قسەی پیاوانە
هەر شەڕە جوێنە و لە یەك هەڵدانە[2]
ئەمە تەعریفی مام رەمەزانە
لەبەری بکە و چاکی بزانە....!
یارەب بە دوورمان بکەی لە ئافات
لادەی لە سەرمان دەرد و مجافات[3]

١٩٢٨

---

[1] هیچ نییە غەیرەز: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "باسی جیهانە یاخۆ".
[2] ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
لەجێی مەرحەبا و هەی "صباح الخير"
هەڕەشە و جوێنە و ناوی قوز و کێر
[3] ئەم بەیتەش لە چاپی پێشوودا نییە.

## مەرهەم و دەرمانی

"بێکەس" ئەم چوار خشتەکییەی لە ساڵی ۱۹۲۱دا خوێندووەتەوە، لە مەکتەبی زانستی، لە سلێمانی"

مەرهـــەم و دەرمـــانی دەردی ئێمـــە تـــەنها مەکتەبـــە
فرســـەتە هەســـتن لـــە خـــەو ئـــیتر چ وەخـــتی نووســـتنە
بـــا چـــرا "زانـــستی" هەڵکـــەین و لـــە زوڵمـــەت دەربـــچین
زۆر بـــەجێ مـــاوین لـــە خـــەڵکی عەیبـــە، عـــارە، مردنـــە

## یانەی سەرکەوتن

یـــــا خـــــوا هـــــەر بـــــژی، یانـــــەی ســـــەرکەوتن
رەهبـــــــەری عـــــــیلم و رێگـــــــەی پێـــــشکەوتن
تـــــۆ مایـــــەی فـــــەخری قـــــەومی کـــــوردانی
باعیـــــــسی روتبـــــــە و نـــــــاو و نیـــــــشانی
دافیعـــــــی جـــــــەهل و زوڵـــــــم و وەحـــــــشەتی
ئەلـــــــەکتریکی شـــــــەوی زوڵمـــــــەتی
قیبلـــــەی ئومێـــــدی هـــــەموو کـــــوردێکی
زیارتگـــــــاهی هـــــــەموو فـــــــەردێکی
میللـــــەت بـــــە تـــــۆوە بـــــەرزو مەســـــعودە
لـــــەناو عالـــــەما نـــــاوی مـــــەوجودە
ئـــــەوی میللـــــەتی لا خۆشەویـــــستە
خزمـــــەتی تـــــۆی لا، فـــــەرز و پێویـــــستە!!
ئـــــەبێ وەك بـــــرا دەســـــت بدەینـــــە دەس
یـــــاری یانـــــە بـــــدەین تـــــا ئـــــاخیر نەفـــــەس
تـــــاکو نـــــاوی کـــــورد بێتـــــە پێـــــشەوە
وەك شـــــێر بێتـــــە دەر لـــــە نـــــاو بێـــــشەوە!

# ئەلەکتریکی سلێمانی[1]

لـــە تـــاریکی نـــەجاتی بـــوو ســـولەیمانی تەماشـــاکە
جلووســە بەزمــە ســەیرانە شــەوی وەك رۆژی رووناکــە
تریفــەی کارەبــا ئێــستا لــە نــاو حــەوز و درەختــا وەك
تریفــەی مــانگ و ئەســتێرە شــەوانی ســایەقەی پاکــە
لەســەر تاســلووجەوە ســەیری نــزارەی ئــەم چــراخانە
بکــە، بــێ شــك ئــەڵێی پاریــسە موکمــەل شــارە ئێــستاکە
لــە زوڵــم و وەحــشیەتی زوڵمــەت ئــەوا رزگــار بــوو خــەڵقی
ســوپاهی نــووری عادیــل وا هجــوومی کــردە ئــەم خاکــە
وەکــو کــۆڵان و ســەرجادە و کــون و قــوژبن منــەوەر بــوو
دەمــاغ و فیکــر و مێــشکمان وەهــا تــەنویر بکــەین چــاکە
حــەکیمی زەخمــی ئــەم کــوردە بگاتــە عــیلم و عیرفــانی
لــە ژێــر بــاری غــەم و وەحــشیەت چــەماوە پــشتی هیلاکــە
بــە عــیلم و یــەك دڵــی ئەوســا ئەگەینــە روتبــە و پایــە
بــە تــەنها میللــەتی یــەك دڵ لــە دنیــا حــوڕ و بــێ باکــە
نیفاق و کینــە دەرحــەق یــەك هەتاکەی بەسیە وا مــردین
خوایــە تــەفر و تونــا بــێ ئــەوی دڵ پــیس و ناپاکــە!!

[1] ئەم هۆنراوەیە لە ساڵی ١٩٣٠دا بە بۆنەی دامەزراندنی مەکینەی کارەبا لە شاری سلێمانی دانراوە.

## ئەی هاوار لە دەست دختۆری خراپ

ئەمان حکومەت هاوار بە ماڵمان
رەحمێ بکە بە ماڵ و مناڵمان!
تووشی دختۆرێکی واتان کردوین
هەموومانی کوشت لە دەردا مردین
ئەگەر زوو بە زوو عیلاجمان نەکەن
ئەم دختۆرەمان زوو لە کۆڵ نەخەن
لێتان مەعلووم بێ خەڵقی ئەم شارە
چارە و نەجاتیان هەر بە فیرارە!
هێند دختۆرێکی بە بێ ویجدانە
حاصڵی عالەم لێی هەراسانە!
نەخێر سەهووم کرد حەمدی هەر چاکە
دختۆرێکی زۆر ماهیر و تاکە!
فائیدەی زۆرە بۆ سلێمانی
بە هۆی خزمەت و کردەوەی جوانی
بەڵام بۆ ئەوەی سائیر لیواکان
لێی موستەفید بن وەك ئێمە و مانان
لوتفەن تەحویلی بکەن لێرانە
ئێمەی لێی تێر بووین نۆرەی ئەوانە !!

## وەسفی حاڵ - بۆ پیرەمێرد —

خاڵــە حــاجی بــا وەکــو مــن مــوفلیس و بــێ پــارە بــێ
بــێ جــەلال و بــێ جــەمیل و بــێ کــەس و دڵ پــارە بــێ
دائیمــا مــەحکوومی قــەهر و میحنــەتی و بــێ چــارە بــێ
شــانی خــواری هەڵتــەکێنێ و باســی میللیــەت بکــا
بــا لــە شــارێکی بەســیتی وەك ســلێمانی نــەبێ
بــا لــەخاکی وا ئەســیر و جاهیلــستانی نــەبێ
بــا لــە ســایەی جــرت و فرتــی خوشــکەزاکانی نــەبێ
شــانی خــواری هەڵتــەکێنێ و باســی میللیــەت بکــا

# پاشکەوت کردن

دەردی مـوفلیس ئـەی رەفیقـان زۆر گـران و زەحمەتـە
عـاجیز و دائـیم لـە دنیـا غـەرقی دەریـای میحنەتـە!
حورمـەت و قـەدر و رەواجـی زەرەیـەك لای كـەس نییـە
سـەر كـز و رووڕەش هەمیـشە نەگبـەت و بـێ هەیبەتـە
گـەر لـە عیلمـا فەیلەسـووف بـێ نـاو و نیـشانی نییـە
گـەر لـە ئەصـلا پادشـا بـێ نـاوی هـەر بـێ قیمەتـە
یـا وەكـو شـێر بـێ جەسـوور بـێ لای هـەموو كـەس رێویـە
یـا لـە حیكمەتـدا وەكـو لوقمـان بـێ ژیـنی زیللەتـە
هـەر كەسـێ مـاڵی صـەرف كـرد لاقی گـەورەش لـێ بـدا
حـاڵی ئـەو بێ شك رەزیلـە و عـەیش و نۆشـی حەسرەتە
مەقصەد و غایەم لەمەشدا موختەسەر هەر عەرزت ئەكەم
پـێ لـە لێفـەی خـۆت زیـاتر رابكێـشی نەگبەتـە!!
پاشـكەوت كـردن لـە دنیـا بـۆ هـەموو كـەس لازمـە،
پەندی "بێكـەس" بگـرە تـاكو تـووش نـەبی بـەم حاڵەتـە!!

# بەشارەت بێ لە قەومی کورد.....

بەشارەت بێ لە قەومی کورد فەلاکەت شوێنی مەفقوودە
لە سایەی خواوە ئەمڕۆژە خەلایق جوملە مەسعوودە
چرای ئاسایشی هەڵکرد، حکومەت حوکمی مەحدوودە
ئیلاهی سەد شوکر ڕۆژێکی چەند پیرۆز و مەحموودە
عەداڵەت، ئەمینەت، ڕاحەت سەراسەر ئێستە مەوجودە

زەمانێ بوو لە ژێر باری مسیبەتدا ئەمان ناڵان
بە دایم گوێچکەمان پڕ بوو لە باسی کوشتن و تاڵان
لە سایەی فەزلی موتسەڕڕیف بەسەرچوو ڕۆژی شوومیمان
ئیلاهی سەد شوکر ڕۆژێکی چەند پیرۆز و مەحموودە
عەدالەت، ئەمینەت، ڕاحەت سەراسەر ئێستە مەوجوودە

کە زاتی پاکی موتسەڕڕیف تەعین بوو بۆ سولەیمانی
نەما لەو ڕۆژەوە ئەتیر نیفاق و جەهل و نادانی
مونەووەر بوو هەموو لایەك بە نووری عیلم و عیرفانی
ئیلاهی سەد شوکر ڕۆژێکی چەند پیرۆز و مەحموودە
عەدالەت، ئەمینەت، ڕاحەت سەراسەر ئێستە مەوجوودە

سەعادەت بوو بە بەرگێك و کرایە بەر هەموو فەردێ
نەما ئەخباری ناخۆشی، لە دڵ دەرچوو هەموو دەردێ
دوعاگۆی زاتی عالیتانە ئێستاکە هەموو کوردێ
ئیلاهی سەد شوکر ڕۆژێکی چەند پیرۆز و مەحموودە
عەدالەت، ئەمنیەت، ڕاحەت سەراسەر ئێستە مەوجوودە

عەجایب بەهرەیەك بوو خوا كە دای بەم قەومی كوردانە
شەوی دەیجووری لێ لاچوو، جەهالەت وا لە فەوتانە
ئەگەرچی نووستووین هەڵسایین، وەتەنمان روو لە عیمرانە
ئیلاهی سەد شوكر رۆژێكی چەند پیرۆز و مەحموودە
عەدالەت، ئەمینەت، راحەت سەراسەر ئێستە مەوجوودە

ئەیلوولی ١٩٢٧

# ساقی لە پەردە دەرهات

"پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلێکی سالم"

گەرد و گوڵی بەیان بوو سەبا کیتابی هێنا
لەو یارە نازدارە راز و عیتابی هێنا
لە خۆشییا کە قاسید هات و جەوابی هێنا
"ساقی لە پەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا
دڵ خیرە ما لە حیرەت مەه ئافتابی هێنا"

بیستوومە ئیمڕۆ دولبەر تەشریفی چۆتە سەیران
هەستام و چوومە سەحرا منیش بە یادی جاران
هۆشم نەما کە بینیم لۆمەم مەکەن رەفیقان
"یەك زەڕڕە عەکسی پرتە و دەرکەوت و تووری سووتان
ئایینە سەخت روو بوو لەو عەکسە تابی هێنا"

وا قەوم و خوێش تەبیبیان هێنا و هاتن بە دەستە
دەستێکی دا لە دەستم فەرمووی کە چیتە هەستە
وتم دەرمانی دەردەم لای تۆ نییە مەوەستە
"تیماری چاکی سینەم راجیع بە چاوی مەستە
بەختیش موافیقی عەشق بۆ من خرابی هێنا"

لە کۆڕی بەزم و رەزما، لە حاڵەتێکی مەستا
دانیشتبووم لە ناکاو عوود و کەمانە وەستا
لە حیرەتا سەراپا مەجلیس عوموومی هەستا
"یارم لە دەردەروون هات دەستی رەقیب لە دەستا
غەمناك و شادمانم، رەحمەت عەزابی هێنا"

دەســـتم لـــەبادە هـــەلگرت ســـاز و نـــەیم فـــڕێ دا
ترســـی قیامـــەتم بـــوو رووڕەش نـــەبم لـــەوێ دا
بـــەرمالّم گرتـــە کـــۆڵ و تونـــد لـــە ملـــم گـــرێ دا
"بـــۆ تۆبـــە ســـوویی مـــەجلیس هـــاتم بـــچم، لـــە ڕێـــدا
بـــۆ کـــوێی مـــەی فرۆشـــان قیـــسمەت شـــیتابی هێنـــا"

جـــەمالی تۆیـــە فکـــری بـــە ئێمـــە بەخـــشی نـــەشمیل
دلّبەنـــدی تـــۆم و دائـــیم غـــەمبار و پەســـتم و دیـــل
مـــەحروومی دیـــدەنیتم دووچـــاری عیللـــەتی ســـیل
"روو هـــەر لـــە مـــن ئەپۆشـــێ، وا حالّییـــە کـــە جیبریـــل
هـــەر خاســـە بـــۆ مـــن و ئـــەو ئایـــەی حیجـــابی هێنـــا"

بـــە ئـــاخ و داخـــی تـــۆوە شـــەو تـــا ســـەحەر ئـــەدەم تـــل
نـــەختێ لـــەخوا بترســـە ئـــەی چاوڕەشـــەی شـــل و مـــل
ئۆبـــالّی مـــن بـــە ئەســـتۆت بەســـیە نـــەما تەحـــەممول
"وەی وەی چ مەجلیـــسێ بـــوو، بـــەه بـــەه لـــە دەیـــدە و دڵ
دولبـــەر شـــەرابی گێـــڕا، ســـالم کـــەبابی هێنـــا"

سلێمانی ١٩٣٢

# خەیاڵی ژێر لێفە

عیلم و نەزانین بخەرە لاوە[1]
هەر پشتت ببێ کارت تەواوە
خزم و خوێش قسەی پیرێ ژنانە
رەفیقی دڵسۆز ئێستە جزدانە
ئافرەتی بێ وێڵ ئەزانی چۆنە
بەخوا هەر وەکو گوڵی بێبۆنە
ئەوی بییەوێ عالەم مەمنوون کا
ئەبێ هەوڵ بدا خۆی بە مەیموون کا
داخی هەندێ کەس لە سینەمایە
رۆژێ رەنگێکە وەك "سینەما"یە
قەت بە زەبر و زەنگ ئیش ناچێتە سەر
مار بە فیکەیەك لە کون دێتە دەر
جوانی بە من چی کە نەفام دەرکەوت
مۆمێك چاترە لە چرای بێ نەوت
جوانێ لە پیرێ گەر مارە بکرێ
بێ شك زەربەیە لە ئەخلاق ئەدرێ[2]
ئەمڕۆ دنیایە و سەبەی مردنە
تێشووی هەر دوو لا چاکە کردنە....

سلێمانی ١٩٣٢

---

[1] عیلم و : لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "جەهل و". دیارە بە هەر دوو جۆرەکە مەعنای بەیتەکە دێت.

[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
دیارە جەزرەبە لە رەوشت ئەدرێ

# گۆڕان.....

بە دەسكارییەوە، لە شیعری شاعیری ئینگلیز: ئی. ویلكۆكس وەرگیراوە.

گۆڕاوم، وێنەی جاران نەماوم، بینایی چاوم
عەشقت لە دڵما دامردۆتەوە، بێتین و تاوم
دیسان هەر مەستی بادەی پێشینم، گیانی شیرینم
چەپگەرد ناتوانێ لە دڵمی دەركا یادی دێرینم
بەڵام خولیاكەی پێشووم نەماوە، هیوام بڕاوە
ژینم هەر وەكو درەختی بێ بەر وشك و بێ ئاوە
چی بكەم داخەكەم ئەو خولیایەی زوو لە سەرم دەرچوو
وێڵم بە دوویا نایدۆزمەوە، ڕۆیی لێم ون بوو
گیانە پێم بڵێ بۆچ وا ئەڕوانی، گۆیا نازانی
دڵیش ئەگۆڕێ، وەك خۆی نامێنێ تاسەی جارانی
تۆ نەختێ سەرنج بدەرە دنیا، هەرچی كە وا تیا،
باڵدار و گوڵ و ئەستێرە و دەریا، درەخت و چیا
ئەمرێ، ئەوەرێ، كز و وشك ئەبێ، ئەگۆڕێ جیا جیا
نازار تۆش سەیری ئاوێنە بكەی ئەوسا تێ ئەگەی
خۆشت ئەگۆڕێی، هەروا نامێنی هەتاكو سبەی
منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە، عەشقم گۆڕاوە
دڵم هەر وەكو گوڵی بێ باران سیس و ژاكاوە

مۆرتكەی بازیان ١٩٢٥

# ساقی نامە

ســــاقی فیـــداتم..... ســـاقی فیـــداتم....
دڵ پەســـــتە، هەســـــتە ســـاقی فیـــداتم
حـــــەیرانی لەنجــــە و بـــــەژن و بـــالآتم
شـــەرابێ بـــا بـــێ بـــۆ دڵـــەی مـــاتم
رەونــــەقێ، شـــەوقێ بـــا بـــە حـــەیاتم
لـــە دەســـتی پەســـتی بـــدا نـــەجاتم
شـــەرابێ وابـــێ عـــومری نـــووحی بـــێ
سەفابەخـــشی دڵ نەشـــئەی رۆحـــی بـــێ
کـــۆن و موســــەففا، لابــــەری جـــەفا
بــــەزم و رابیتــــەی یـــارانی وەفـــا
شـــــەرابێکی وا بـــــە تـــــەنها جامـــێ
تـــەکامول بکـــا خامــــێ، نـــــەفامێ
قـــەدەح پەیاپـــەی پـــڕ کـــە لێواولێـــو
بێنیـــە و مەترســـە لـــە تەعنـــە و جنێـــو
ســـاقی فرســـەتە.... ســـاقی فرســـەتە.....
دەخیــــل مەوەســــتە ســـاقی فرســــەتە
وەخـــتی خواردنـــەوە و کـــەیف و عوشـــرەتە
موغـــەننی ســـا تـــۆش رۆژی هیممەتـــە
دڵ زۆر گـــــیرۆدەی دەنـــگ و نەغمەتـــە
توخـــوا قـــەتارێ دڵ بـــۆی لـــەت لەتـــە
بـــە ناڵـــەی نـــەی و نەغمـــەی ئەرغـــەنوون
بـــە نەشـــئەی مـــەی و شـــەرابی گـــوڵ گـــوون
بـــا لـــەدڵ دەرکـــەین ســـزایی گـــەردوون
ئاســـــوودە ســـاتێ دڵ ببـــێ مـــەجنوون

ســــاقی بـــەهارە.... ســــاقی بـــەهارە
ســــاقی بڕوانـــــە دنیـــا بـــەهارە
زەمـــین ســــەراپا گــــوڵ و گــــوڵزارە
چـــریکەی بـــاز و نەغمـــەی هـــوزارە
نـــەورۆز پەیـــدا بـــوو لـــە گـــردی یـــارە
تێبکـــە لـــە چـــاوی ئـــەو عیـــشوەدارە
کـــوا فرســـەتێکی هـــەر وەك ئـــەمجارە
تێبکـــە چ وەخـــتی تـــوانج و عـــارە[1]

ســـاقی ئۆبـــاڵی منـــت بـــە ئەســـتۆ
دنیایـــە وەســـیەت ئەکـــەم لـــە لای تـــۆ
کـــە مـــردم توخـــوا هـــەر بـــە مـــەی بمشۆ
بـــۆم مەکـــەن شـــین و گریـــان و رۆرۆ
لـــە جێـــی یاســـین و تـــەڵقین و شـــینم
بـــێن کـــۆڕێ بگـــرن لـــە ژوور ســـەرینم
بـــە بـــەزم و رەزم و بـــە ئـــاوازی خـــۆش
ئێـــسك و پرووســـکم هـــەموو بێتـــە جـــۆش....

تەوێڵە ١٩٢٦

---

[1] ئەم کۆپلەیە لە چاپی یەکەمدا نییە.

# شۆری بێکەس

دڵــێ تــەڕ نــەبێ... دڵــێ تــەڕ نــەبێ....
دڵــێ لــە خۆیــا دائــیم تــەڕ نــەبێ....
سەرخۆشــی بــادەی رووی دولبــەر نــەبێ
بــە جـامی شـەراب کـەیل و مەسـتی کـەی
خوایــە ئــەو دڵــە دائــیم پەســتی کــەی

دڵـــێ هێلانـــەی عەشـــقی یـــار نـــەبێ
بـــە تـــیری نـــازی برینـــدار نـــەبێ
کوشـــتەی دوو دیـدەی پـــڕ خومـــار نـــەبێ
بــە جـامی شـــەراب نەشـئەی پـێ بـدەی
خوایــە ئــەو دڵــە دائــیم پەســتی کــەی

دڵــێ کــە کانگــای مەعریفــەت نــەبێ
سەرچــاوەی عەشــق و مەحەببــەت نـەبێ
رەهبــەری رێگــەی حەقیقــەت نــەبێ
بــە جــامی شــەراب جیلــوەی دەربخــەی
خوایــە ئــەو دڵــە دائــیم پەسـتی کــەی
دڵــێ دووچــاری خەفــەت نـــەبووبێ
بە شمـشێری عەشـق لـەت لـەت نـەبوو بـێ
پــەروەردەی دەرد و میحنــەت نــەبوو بــێ
ئــاواتی نــەبێ غــەیرەز مــەی و نــەی
خوایــە ئــەو دڵــە دائــیم پەسـتی کــەی.....

سلێمانی ١٦/٧/١٩٣٧

# نائومێدی.....

پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلێکی کوردی

لــە دنیــادا نییــە وەك مــن بــە عەشــقی ئــەو گروفتــاریٚ
ســەرو مــالٚم لــە رێــی دانــا، کەچــی لــوتفی نــەبوو جــاریٚ
ســەفیل و دەربــەدەر رۆژی لــە کووچــە و قــوژبنی شــاریٚ
"ئــەمان مــردم عیلاجــیٚ، ســا لــە رێــی پێغەمبــەردا چــاریٚ
ویسال یـا قەتلٚـە یـا تەسـکین، لـە هـەر سـیٚ بـۆم بکـەن چاریٚ"

تفـوو لـەم دەهـرە پـڕ قـەهرە، لـە خۆشـی و سـەروەت و بـوونی
ئــەوی دانایــە بــۆی نایــە، ســەفایە لای کــەر و کــوونی
لــەداخی دەوری ناهــەموار و پیــشە و کــردەوەی دوونــی
"لـە کـونجی سینە دەنگـی ئـای و ئـۆی دلٚ دیٚ بـە مـەحزوونی
وێــران بــیٚ نەمــدی ســاتیٚ لێــی نــەییٚ نالٚــەی بریـنــداریٚ"

هەموو کـەس پـێم ئـەلٚیٚ شـێتی وەهـا خـۆت مـەحوو بـەربا کـرد[1]
لـەرێی ئـەم خاکـەدا فـەوتاوی و سـەد لەککـەت کـە پەیـدا کـرد
چ سـوودێکی هـەبوو بـۆ تـۆ ئەوەنـدت جـەنگ و دەعـوا کـرد
"ئەلای هەر کەس ئەچـم مـەنعم ئـەکا خـۆت بۆچـی ریـسوا کـرد
درێــغ کــوا حــالٚ زانــیٚ، رەبــبی تووشــم بــێنی بیمــاریٚ"

---

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندیٚ نوسخەدا بەم جۆرە نووسراوە:
گەلٚیٚ کەس پێم ئەلٚیٚ شێتی کەوا خۆت سووك و رسوا کرد

لە کۆڕی عەشق و دڵداری هەتا زوو دەربچم چاکە
هەموو رەنجم بە فیڕۆ چوو لەگەڵ ئەو شۆخە بێ باکە
رەزیل و سووك و ریسوا بووم وەرە حاڵم تەماشاکە
"لە ژێر باری غەما وا شانی سەبرم ریشە ئێستاکە
فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕی لێم بۆتە سەرباری"

ئیلاهی بۆچ لە دونیادا بەشی من شین و گریان بێت
عەدەم لەم ژینە خۆشتر بوو عەریزەم خۆ نەدابوو پێت
هەمیشە وێڵ و سەرگەردان بە سەودای عەشقەوە وەك شێت
"سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من ئەپرسن لێت
بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچوە عەییاریێ"

سەفا دوورە لە ئینسانی ئەدیب و عاشق و شاعیر[1]
بەشی هەر دەرد و زووخاوە، دەروونی کەیلە پڕ ئاگر
چ دڵ سەختێکە تووشی بووم نەجاتم دەی خودای قادر
"لە نەزعا پێی ئەڵێم قوربان جەفا بەسیە، ئەڵێ کافر
ئەرێ چیت دیگە تۆ سەگ مەرگی کارم ماگە پێت جارێ"

برا کەوتوومە بەر لیسی زەمانە و چەرخی چەپ کردەی
بە ناشوکری نەبێ رۆژێ نەبوو بۆ خۆم بڵێم ئۆخەی[2]
عیلاجی دەردی من نایە بە عوود و روود و جامی مەی
"وەها سووتاوم ئەسڵەن تابی فریادم نەما سا دەی
رەفیقان نیوە سووتن ئێوە نامەرد عەرزە هاواری"

---

[1] ئەدیب و : لە هەندێ نوسخەد نووسراوە "زرنگ و".

[2] نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
درێغا دۆستان رۆژێ نەبوو بۆ خۆم بڵێم ئۆخەی

هـــەزاران رەحمـــەت لـــێ بـــێ لـــە شـــیعرا چـــەند تـــەڕ و وردی
عـــەزیزم "مـــستەفا بـــەگ" تـــۆ نـــەمردووی، کـــێ ئـــەڵێ مـــردی
جـــوابی وایـــە "بێکـــەس" گـــەر بڵـــێن تەقـــدیری بـــۆچ کـــردی
"دوڕ و یـــاقووت ئـــەبارێ لـــەم کەلامـــە شـــیرنەی (کـــوردی)
دەســـا خـــوا کـــوا لـــە دنیـــادا قـــەدرزان و خرپـــداری"

سلێمانی ۱۹۳۹/۱۱/۲۰

# زەحمەتە بێ مەی ژیانم

داخی قەرزاری عەرەق خستوومیە فاك و فیکەوە
گا بە دەس جەرجیس و عەبدە و، گا بە دەس ئۆفیکەوە
هەر کە رۆژئاوا ئەبێ من بۆ عەرەق سمکۆڵ ئەکەم[1]
وەك وڵاخێ بێتە وەختی کاو و جۆ و ئالیکەوە
چنگ لەسەر شان بۆی ئەڕۆین خۆم و لەگەڵ چەند نەگبەتێ
بۆ پەنا ئاشێ بە مەززە و قاپی مل باریکەوە
جا بە چوار مەشقی لەسەر ئەرز دائەنیشین کۆمەڵێ
بەزمە ئێواران بە دەوری عارەقی مەستیکەوە
خۆشە سەرخۆشی ئەگەر تووشی رەفیقی تووش نەبی
رابوێری هەر بە گۆرانی و قسەی عەنتیکەوە
عارەق و پارە لە هەر دوو گەر سەر و روبعم هەبێ
چیمە ئیتر من بەسەر ئەڵمان و رووس و چیکەوە
هەقمە گەر ئارەق بخۆم توخوا رەفیق لۆمەم مەکەن
زەحمەتە بێ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریکەوە.....

تەشرینی دووەمی ١٩٣٩

---

[1] هەر کە رۆژ ئاوا ئەبێ من: لە هەندێ نوسخەدا "هەر کە رۆژ ئاوا بوو ئیتر......"

# عارەق ئەخۆم[1]

مـن عـارەق ئـەخۆم کـە بـێ کـەدەر بم
کـەمێ لـە دنیـای دوون بـێ خەبـەر بم
گـەڵێ سـزام دی لـە رووی عەقڵـەوە
بـادەی مـەی بخـۆم، بـێ هـۆش و کـەر بم[2]
عـافێتی تـۆ بـێ بامـێ و قووبـوڵی
بـا مـن بـە عـارەق تووشـی زەرەر بم
بەهەشـت کـە پـڕ بێ لـە وشـکە سـۆفی
ئاواتـەخوازم کـە لـە سـەقەر بم
نامـەوێ بـەرگی ریـا و زاهیـدی
ئەگـەر بـەو بەرگـەش زۆر موعتەبـەر بم
کورسـی مەیخانـەم لـە لا خۆشـترە
لـەوەی کـە لەسـەر تـەختی قەیسـەر بم
سـاقی دەخیلـە بمـدەرێ جامـێ
بـا لـە عالـەمی مـادە بـەدەر بم
رزگـارم ببـێ لـە چـەند و چـۆنی
موددەتـێ بـۆ خـۆم بـێ دەردیسـەر بم[3]

[1] ئەم پارچە شیعرە لە وەڵامی پارچە شیعرێکی "زێوەر" دا وتراوە.
[2] بادەی مەی بخۆم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "با کەمێ بۆ خۆم".
[3] موددەتێ: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "با کەمێ".

# بێزاری

لـه حـالْم بۆیـه بێـزارم، تەماشـاکەن کـه چـەند عەکـسم
له پەستی بەختی ناپوخـت و لـه بـەرزی عیززەتـی نەفـسم
لـه کـوللی ییـەی ژیانـا مـن هـەزاران تەجرەبـەم دیـوە
کەچـی ئێـستاکە وا تـازە خـەریکی مەکتـەب و دەرسـم
بە دووڕوویی و درۆ و ساختە گەڵێ کەس پێ گـەیی، ئـەمما
منی "بێکـەس" لەسـەر راسی بـە دائیم گیرەوەی حەپسم
ئەوانـەی دوێنـێ گاڵتـەم پـێ ئـەکردن ئێـستە زۆر بـەرزن
تفوو لەم بەختـە سەرسـەختە و لـە ناوچاوانی وا نەحـسم
زەمـانی پیـاوی جاسووسـە، چ وەخـتی سـیدق و نامووسـە
لـە هـەر لا باسـی ئـەخلاق و وەفـا بکـرێ ئـەبێ هەڵـسم[1]
ئەوەندە تەعقیبی حەقتم کرد هەتا وا سووك و رسوا بووم
هـەزاران لەعنـەتم بـۆ دێ لـە هـەر شـوێنێ کـرا بەحـسم
رەواجـی کوانـێ لای خـەڵقی وتـار و شـیعری پـڕ مـەعنا
گـەڵێ کـەس پێکـەنینی دێ بـە گوفتـار و دەم و لەوسـم

١٩٤٤

---

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
لە هەرلا باسی ئەخلاق و وەفا کەن، من ئەبێ هەڵسم

# شینی مستەفا مەزهەر

دەك فەلـەك چـەرخت شـكێ گـشت كـردەودت خونخوارییـە
بۆچـــی تـــەبعت وا هەمیـــشە مـــائیلی غەددارییـــە
رۆژ نییــە ئــەم خەڵقــە تووشــی شــین و واوەیـلا نەكـەی
شـەو نییـە عالـەم رەحـەت بـێ، هـەر لـە گریـە و زارییـە
شـــەربەتت زەهــرە، ژیانـــت قـــەهرە، لوتفـت هــەر شــەڕە
بـەزم و ڕەزمـت شـیوەنە، كـەیف و سـەفات غەمبارییـە
گەر بە دوو چاوی عـەقڵ سـەیرت بكـەین جـا تـێ ئەگـەین
دڵ بـــە تـــۆ بەســـتن خەتایـــە و عیللـــەتی بـــێ عارییـە
"مستەفا مەزهەر" كـە دوێنـێ رەهبـەری ئـەم خەڵكە بـوو
كۆچـی كـرد داخــی بــە جـەرگم كۆچـەكەی ئێجگارییـە
ئـــاخ چ دەردێكـــی گرانـــە بـــۆ گـــەلی كـــوردی هـــەژار
قـەت بــە دەم نــاكرێ بـەیانی هێنـدە سـەخت و كارییـە
هـــەر كەســـێ رۆژێ ئـــەوی دیبـــێ دەروونـــی لـــەت لەتـــە
پەســـت و دامـاوە لـە داخـا، خـوێن لـە چـاوی جارییـە
ســـاڵی تـــەئریخی وەفـــاتی وا بـــە نـــاوی هاتـــەدەر
"مـستەفا مەزهـەر" غـەریقی رەحـم و لـوتفی بارییـە[1]

١٩٤٦

---

[1] بە مەرجێ ناوەكەی بە تیپ و بەئیملای عەرەبی بنووسرێ كە ئەكاتـە ١٣٧٤ و ئـەوەش ساڵی كۆچی دوایی مستەفا مەزهەرە.

# شینی محەمەد ئەمین زەکی بەگ

لە کۆبوونەوەی چلەی مێژوونووسی کورد "محەمەد ئەمین زەکی بەگ"دا خوێندوویەتیەوە.

بەشـی کـورد ئـەبێ دەرد و خەفـەت بـێ
ڕۆژێ بـە تـیرێ جـەرگی لـەت لـەت بـێ
ئاسمـانی بـەختی لـێڵ و تاریـك بـێ
ئەسـتێرەی کـز و ڕوو لـە مەینـەت بـێ

قـەت نـەبوو ڕۆژێ گەردشـی دەوران
چـەرخی هەڵـسووڕێ بـە کـەیفی کـوردان
ناشـوکری نـەبێ خۆشـی لـە ئێمـە
دوورە بـە غـەیری شـیوەن و گریـان

بـەڵێ زەمانـەی چـەرخی کـەچ ڕەفتـار
وا لێمـان بۆتـە دوژمـنی خوێنخـوار
دایـم خەریکـە و بـۆ هـەل ئەگـەڕێ
زیانـێ بـدا لـە کـوردی هـەژار

ورد سـەرنج ئـەدا کـێ بـە قیمەتـە
کـێ نـەختێ خـاوەن هـەوڵ و هیممەتـە
گـورج و ئـەیرفێنێ و لـە نـاوی ئـەبا
سـەیری کـە چـەندە چـەوت و نەگبەتـە

جـەنابی "ئـەمین زەکـی بـەگ" کـەوا
پیـاوێ بـوو بـۆ کـورد گـەورە و پێـشەوا
داخـی بـە جـەرگم زوو لـە دەسمـان چـوو
نـازانم بڵـێم چـی لـە هـەق ئـەوا؟!

پیاوێ بوو هەتا بڵێن مونەووەر
خاوەنی عیلم و ئەخلاق و هونەر
عومری خۆی دانا لە رێی خزمەتا
پێویستە قەدری بگرینە سەر سەر

پیاوێك بوو بۆ كورد تەئریخی نووسی
لای نەدا لە رێ: مەوقیع و كورسی
زۆر فیداكار و میللەت پەرست بوو
هەواڵی قەومی بە دڵ ئەپرسی

پیاوێكی زانا و هێمن و بە بیر
رەوشتی بەرز و بە ڕا و تەدبیر
ئاواتەخوازی بەرزی وەتەن بوو
پشتیوانێ بوو بۆ لات و فەقیر

پیاوێ بوو نەما، زۆر تەواو پیاو بوو
خاوەن كردار و مەوقیع و ناو بوو
پیاوی وا نامرێ، دیارە ئەمێنێ
لەناو عالەما بەرز و ناسراو بوو

ئەی خاك دەخیلتم قەدری بزانە
ئازاری نەدەیت لە لات میوانە
تەئریخی كۆچی "ئەمین زەكی بەگ"
"میللەت مەحزوونە، زۆر پەرێشانە"[1]

---

[1] بە رێنووسی كۆن واتە بەم جۆرە: "ملت محزونە زور پریشانە" كە ئەكاتە ١٣٦٧ و ئەوەش بە ساڵی كۆچی ساڵی كۆچی دوایی ئەمین زەكی بەگە.

## دەردی دەروون

بێکەس:

دەمێکـــــە، یـــــاران، مـــــات و خامۆشـــــم
وێنــەی تلیـاك کـێش مەسـت و بـێ هۆشـم
خـــۆم لـــە تەنقیـــدات دوور خـــستۆتەوە
هـــەوالّی دنیـــام لـــە بـــیر چـــۆتەوە
نـــازانم دنیـــا رۆژە یـــا شـــەوە
هـــەموو کـــارێکم خـــواردن و خـــەوە
لـــە دەنـــگ و باسـی خـــەڵقی بـێ خەبـــەر
وەك حـــەیوان ئـــەژیم، دوورم لـــە بەشـــەر
خـــەریکی چـی بم غـــەیرەز خواردنـــەوە
باســـی قومـــار و پـــارە بردنـــەوە
حەقمـــە، لـــێم گـــەڕێ تەعنـــەم لـێ مـــەدە
حـــەقێکی ئـــەوتۆ لەســـەدا ســـەدە
مـــردم ئەوەنـــدە هـــەوڵ و چـــەنەم دا
هـەر چـێکم نووسـی گـشتی چـوو بـە بـا
قـــەومێ کـــە دائـــیم هـــەر هـــەوڵ بـــدەن
بـــۆ ئـــەوەی یـــەکتر بـــە ئـــەرزا بـــدەن
بایـــە لـــە لایـــان میللـــەت و وەتـــەن
هیـــوا ئـــەمێنێ ئـــەوەی دەنـــگ بکـــەن
غـــەیرەز نیفـــاق و بـــێ ئیتتیفـــاقی
فەســـاد و فیتنـــە و ڕێـــی بـــێ ئـــەخلاقی
چـــی تـــر ئـــەزانین؟ وازم لـــێ بێنـــە
پـــەردەی ئەســـرارم زۆر پـــێ مەدڕێنـــە
قـــسەم زۆر مـــاوە رەقـــە وەك بـــەردە
کاکـــە لـــێم گـــەڕێ، بـــەرۆکم بـــەردە...

پیاوێکی تر:

"بێکەس" من نەم وت تۆ وا وەستا بیت
لە باسی خەڵقا تا خۆت وەستابیت
نەگبەت دامرکێ، چیتە لە میللەت
سەیری خۆت ئەکەی چۆن بووی بە عیبرەت
رەفیقت هەموو ساحێب مەعاشن
خاوەنی پارە و وەزیفەی باشن
مەڕوانە ئەوەی فلان جاسووسە
خائین و عادی زۆر بێ نامووسە
ئەمەت پێ ئەڵێم، ئەتۆش بینووسە
ئیمان و دین و شەرەف فلووسە!
عالەم خەریکی روتبە و پارەیە
هەر تۆ بە تەنیا جەرگت پارەیە
ئەوەند قسەت کرد نانی خۆت بڕی
ماڵت وێران بێ چەند ئاخر شەڕی
کێ گوێ ئەداتە شیعر و نەسیحەت؟
کێ پەسەند ئەکا قسەی بە قیمەت؟
ئەمڕۆ زەمانی روپیە و ئانەیە
ئەمانە قسەی منالانەیە
کوا پیاوی دڵسۆز، کوا وەتەن پەروەر؟
کوا خاوەن غیرەت، کوانێ مونەووەر؟
بەسیە، قسەی خۆت بۆ خەسار ئەکەی؟
عالەمێ لە خۆت بۆچ بێزار ئەکەی؟
دانیشە، ئیتر چیت لە کورد داوە؟
بۆچ خۆت ئەخەیتە ئەم گێژ و داوە؟

سەد ساڵ لەسەر یەك تۆ ئیرشاد بكەی
خەڵك وا ئەزانێ زوڕنا لێ ئەدەی
من باكم نییە، هەر لەبەر تۆمە
قسەت كار ناكا، بەردی بن گۆمە

بێكەس:

بەڵێ فەرموودەی تۆ لەسەر چاوم
راستە بۆیە من سووك و بەدناوم
دائیم دەربەدەر وا نان بڕاوم
چی بكەم، بڵێم چی، وەها خولقاوم
هەتا بمێنم قسەی حەق ئەكەم
جوێن بە ئینسانی خائین هەر ئەدەم
گەرچی راست وتن شەقی لە دوایە
خۆشە لە لای من، وەكو حەڵوایە
ئەوەی بە ناحەق شتێ بنووسێ
پەنجەی هەڵوەرێ و چاوی بنووسێ
مەقسەدم تەنیا نەشری ئەخلاقە
بڕینی رەگی فیتنە و نیفاقە
ئەخلاق رەهبەری رێی پێشكەوتنە
پەیژەی تەرەققی و زوو سەركەوتنە
دەلیلی رێگەی فەوز و نەجاتە
سەرمایەی فەخر و بوونی حەیاتە
قەومی بێ ئەخلاق پەست و زەلیلە
هەر بەشی شەقە و سەركز و دیلە
ئەمە پەندێكە بۆ چاكی ئێوە
نامەوێ هیچم دەس كەوێ لێوە

سلێمانی

# بەهاری سلێمانی

سەحرا ئەڵێی بەهەشتە
دڵ ئارەزووی لە دەشتە
حەزی لە سەیری گەشتە
کوژراوی چاوی گەشتە
گیرۆدەی خاڵی رەشتە
یارم شازادەی رەشتە

رۆژێکی بێ قوسوورە
دنیا باغ و قوسوورە
پڕ لە غیلمان و حوورە
خەفەت لە دڵ بە دوورە
گوێت لە نەغمەی تویوورە
وێنەی ساز و سەمتوورە

"پیر میکاییل" ببینە[1]
دلگیر و خۆش و شینە
هەر وەك تاوس رەنگینە
جێی بەزم و هەڵپەڕینە
سەیران و پێکەنینە
پڕ نازو نازەنینە

---

[1] پیر میکاییل: سەیرانگایەك بوو لە سولەیمانی.

جـێ هــەر "قۆریــە شــکاو"ە[1]
وێنـــەی خـــۆ نـــەبینراوە
مەشـــهوور و زۆر بـــە نـــاوە
بڕوانـــی لـــە هـــەر لاوە
دەســـــتەی کـــچان و لاوە
وەك چــــــنار و لاولاوە

خۆشـــی لـــە "سەرچـــنار"ە[2]
چـــیمەن و مێرغـــوزارە
هەواکـــــەی میـــــشکبارە
دار و بـــــەردی خومـــارە
ســـــەیرانکەری هـــــەزارە[3]
جێـــی بولبـــول و هـــوزارە

چوارشـــــەمموان هەرایـــــە
ڕۆژی بـــــەزم و ســـــەفایە
ئـــــازادی ئاشـــــکرایە
ڕەش بەڵـــــەك و ســـــەمایە
بـــــۆ دەردی دڵ دەوایـــــە[4]
کاشـــکی هـــەروا بووایـــە

[1] قۆریە شکاو: جێ سەیرانێك بوو لە ڕۆژاوای سولەیمانی لە نزیکی موشیر ئاوا.
[2] خۆشی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "دووهەمین".
[3] سەیرانکەری: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "سەیرانگەهی".
[4] بۆ دەردی.... تاد: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "ژیانی ئەورووپایە".

خوایـــــه هـــــهموو بـــــههاران
بـــه خۆشـــی خـــزم و یـــاران
بـــچینه بـــهزم و ســـهیران
ئێمـــهش هـــهر وهكـــو شـــاران
بـــه نـــووری عـــیلم و عیرفـــان
ئـــاوا ببـــێ وهتـــهنمان

سلێمانی

# ئەی مانگ

ئەی مانگ من و تۆ هەر دوو هاودەردین
هەر دوو گرفتار یەك ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و رەنگ زەرد بە ئاسمانەوە
منیش دەربەدەر بە شارانەوە
دەخیلتم ئەی مانگ قیبلەی دڵداران
دەرمانی دەردی دڵەی بیماران
شەوێکە و ئەمشەو بگەرە فریام
بێ یار و هاودەم عاجز و تەنیام
دڵزار و بێزار پەست و غەمگینم
گیرۆدەی داوی یاری شیرینم
دڵبەندی عەشقی ئەو بەڵەك چاوەم
شێت و شەیدای ئەو ئەگریجە خاوەم
لەوساوە ئەوم کەوتۆتە خەیاڵ
گریانە پیشەم بوومە کۆی زوخاڵ
ئەی مانگ تۆ شوعلەی عەشقی پیرۆزی
تۆ نەشئەبەخشی دڵی بەسۆزی
من سوێندت ئەدەم بە عیشق و جوانی[١]
بە نەسیمەکەی بەری بەیانی
بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان کە
دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە
دوچاری چی بووی وا پەشێواوی؟
لەبەرچی پەست و مات و داماوی؟

---

[١] من سوێندت ئەدەم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە"قەسەمت ئەدەم".

پـــێم بڵـــێ توخـــوا چـــەند جوانـــت دی؟
چـەند جووتــە یــاری دەس لــە ملانــت دی؟
چـــەند کـــۆڕی بــــەزمی عاشــــقانت دی؟
چـەند تـەخت و بـەخت و خـان و مانـت دی؟
چـەند قـــەهرەمان و چـــەند ســـوڵتانت دی؟
چـەند قـەوم و میللـەت، چـەند شـارانت دی؟
چـــەند شـــەڕ و شـــۆڕی بـــێ ئامانــت دی؟
چـــــەند بۆردومــــانی کوردســــتانت دی؟
چـــەند کفـــنی ئـــاڵی شـــەهیدانت دی؟[1]
چـــەند بـــێ کەســـانی پەرێـــشانت دی؟
چـــەند دەربــــەدەر و مـــاڵ وێرانــــت دی؟
چـــەند چـــاوی ســـووری پـــڕ گریانـــت دی؟
ئـــەی مـــانگ ئەوەنـــدە ســـەیری دنیـــات کـــرد
ســـــەیری نیفـــاق و زوڵـــم و ریـــات کـــرد
بۆیـــــە بـــــەم رەنگـــــە کــــاری لــــێ کــــردی
رەنـــگ و شـــوعووری بـــە جـــارێ بـــردی

[1] نیوەی دووهەمی بەیتی پێشوو و نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا نین.

# لای لایەی "شێرکۆ"

رۆڵــە، لای لایــە.... (شــێرکۆ) لای لایــە....
شــەوگار درەنگــە.... بــۆچ خــەوت نایــە؟
دنیــا کــش و مــات لــە هــەموو لایــە
هەرچــی درەخــت و دەشــت و چــیایە
وا لــە ژێــر بــاڵی رەشــی شــەوایە
نــە دەنــگ، نــە سـروە هیــچی لــێ نایــە
رۆڵــە، لای لایــە... (شــێرکۆ) لای لایــە.....
یــاخوا شــێرانە بێیتــە نــاو کایــە....

بنــوو بــە خۆشــی هــەتا بــەیانی
خــەوی ژێــر پــەردەی پــاکی یــەزدانی
گریــانی چــیتە، تــۆ چــی ئــەزانی؟
تــۆ تــازە غونــچەی بــاخی ژیــانی....
کۆرپــەی نــازدار و فریــشتەی جــوانی
رۆڵــە، لای لایــە......(شــێرکۆ) لای لایــە.....
یــاخوا شــێرانە بێیتــە نــاو کایــە

پەپوولــەی ســپی نــاو بــاخی گــوڵان
بنــوو بــە بــێ تــرس تــا بــەری بــەیان
تــۆم داوەتــە دەس خــودای نیگــەهبان
ئیــشك گــری تــۆن پــەری ئاسمــان
هیــوای دوارۆژی بــۆ قــەومی کــوردان
رۆڵــە، لای لایــە.... (شــێرکۆ) لای لایــە....
یــاخوا شــێرانە بێیتــە نــاو کایــە....

زەردەخەنەکــەت پــڕ نەشــئە وەك مـــەی
گــڕ و گاڵەکــەت خۆشــتر لــە ســەد نــەی
ئاواتـــــەخوازم کـــــە زوو پــــێ بگـــــەی
بــە شــەرتێ کــە مــن ڕەنجــەڕۆ نەکــەی[1]
ڕۆڵــە، لای لایــە.... (شــێرکۆ) لای لایــە....
یـــاخوا شــێرانە بێیتـــە نــاو کایــە.....

ڕۆڵـــە وا مـــن تـــۆم هێنایـــە بەرهـــەم
بـــە ڕەنجـــی زۆر و بـــە شــیری مەمـــەم
بــە شـــەونوخونی و، ناخۆشـــی و ســـتەم
ئەوەنـــدە لـــە خـــوا تەمـــەننا ئەکـــەم:
وەتــەن ڕزگــار کــەی لــە ژێــر بــاری غــەم
ڕۆڵــە، لای لایــە..... (شــێرکۆ) لای لایــە....
یـــاخوا شــێرانە بێیتـــە نــاو کایــە.....

---

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
هەوڵ بۆ بەرزی خاکەکەت بدەی

# ئەستێرە گەشە

ئەستێرە گەشەی بە حەواوە
سەرم وا لە تۆ سوورماوە
هەر سەیرت ئەکەم تێ ناگەم
کێ تۆی لەو جێیە داناوە؟

بە شەو کە دێمە سەربانی
سەیرت ئەکەم لە ئاسمانی[1]
لەناو فەزای شین و جوانی
جریوەت دێ تا بەیانی

بۆیە وا شاد و مەسرووری
سەربەست و بەرز و رووسووری
دائیم دڵ روون و پڕ نووری
چونکە لەم دنیایە دووری

خۆزگەم ئەمەیە ئێستە تۆ
بهاتیتایە گفت و گۆ
شەرحت بکردایە لە بۆ
منی هەژاری دەس خەڕۆ

بەردی، درەختی، یا بەشەر؟
ئەڵماسی، زیوی، یا گوهەر؟
گیرەوەی تۆم و پڕ کەدەر
پێم بڵێ زوو بە موختەسەر

[1] سەیرت ئەکەم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "تێت ئەفکرم".

جـــــوابی دامـــــــەوە کـــــــەوا
کورەیـــــــەکم لـــــــەناو فـــــــەزا [١]
بـــــە ئـــــەمڕۆ قـــــودرەتی خـــــودا
راوەســـــــتاوم لـــــــە رووی ســـــــەما [٢]

سلێمانی

---

[١] فەزا: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەوا".

[٢] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە

# چ خۆشه!

چ خۆشـــه دەســـتەیەك دڵـــسۆز و یـــاران
رەفیقـــی یـــەكترى بـــێ غـــەرزكاران
بـــه تـــاقم پێكـــەوە فەســـڵى بـــەهاران
بـــچینه بـــەزم و رەزم و كـــەیف و ســـەیران
لەســـەر ئـــاوێ بـــه كۆمـــەڵ دابنیـــشین
بـــه نەشـــئەى بەســـتەوە بـــادە بنۆشـــین

بـه یـارى و پێكـەنین و شـەوق و سـوحبەت
بـه سـەیرى مـەنزەرە و سـیحرى تەبیعـەت
بـه زیكـرى سـانیع و تەقدیـسى خیلقـەت
لـه دڵ دەركـەین بوخـارى دەرد و میحنـەت
لـــه گـــوڵزارا بـــه ئاهـــەنگ دابنیـــشین
بەرامبـەر دەشـت و شـاخى سـەوز و رەنگـین

لـــه بـــیرت غائیلـــەى دنیـــا بـــەدەر كـــه
لـه باسـى نیـك و بـەد، توخـوا، گـوزەر كـه
بەسـێتى چـاوەكەم (بێكـەس) حـەزەر كـه
لـه خـوار و ژوورى خـۆت سـاتێ نـەزەر كـه
زەمینـــه پـــڕ گـــوڵ و رەیحـــان و نەســـرین
ســـەمایه قوببـــەیێكى شـــین و نەخـــشین

ئەگـــەر تـــۆ خـــاوەنی ئیـــدراك و هۆشـــی
لـــە مـــازی و پاشـــەڕۆژ چـــاوت ئەپۆشـــی
ســـەعادەت لەحزەێیکـــە تـــۆ بـــە خۆشـــی
لـــە ســـەحرا رابـــوێری و مـــەی بنۆشـــی
دە ســـاقی تێکـــە توخـــوا تـــاکو ئـــەمرین
مەعیـــشەت تەوقـــە بـــۆ ئینـــسانی غـــەمگین

سلێمانی

# شینی قالەی ئایشەخان

وا کوژایـــــــــەوە..... وا کوژایـــــــــەوە.....
ئەســــــــتێرەی هیـــــوا وا کوژایـــــــەوە
دەروازەی خۆشـــــــــی داخرایـــــــــەوە
دەرگــــای شــــوومی شـــین وا کرایـــەوە
دڵــــی هــــەزاران بـــــۆت تووایــــــەوە
دڵــــەی هـــەژار بـــۆت بۆتـــە بریـــانی
حەشـــــرە، هەرایـــــە لــــە ســـــولەیمانی
لــــە هــــەر لا ئـــەڕۆی دەنگـــی گریانـــە
شـــینە، شـــیوەنە، یـــا قـــوڕ پێوانـــە.....

قالــە گیـــان! لـــە دوای تــۆ خۆشـــی نـــەما
هەرچــــی بتناســــێ غەرقـــە لــــە خـــەما
هاوفـــەردان! توخـــوا بـــا کـــۆڕێ بگـــرین
هـــەتا فرمێـــسکمانە هەیـــە بـــۆی بگـــرین
کـــە فرمێـــسك نـــەما بـــە ناڵینـــەوە
ئــــەم چـــەند فەردانـــە بخوێنینـــەوە:
پـــــەنای هـــــەژار و کەساســـــانم ڕۆ!
داڵــــدەی هـــەتیو و بـــێ کەســـــانم ڕۆ!
دەســـکی گـــوڵی نـــاو مەجلیـــسانم ڕۆ!
چـــرای ئاهـــەنگی نـــاو دۆســـتانم ڕۆ !
شـــێری مەیـــدانی نـــاو ژیـــانم ڕۆ !
هـــاوارە قالـــەی ئایـــشە خـــانم ڕۆ!
هـــاوارە قالـــەی نەوجـــەوانم ڕۆ !

# ئەو دولبەرە....

عالەم ئەکاتە مەسخەرە
بۆ سەیری خۆی ئەو دولبەرە
نەسیحەتت ئەکەم وەرە
باوەڕ بە وەعدەی ئەو نەکەی....

قسەی شیرینە، شیلەیە
ئەو چاوشینەی خنجیلەیە
بە ناز و مەکر و حیلەیە
باوەڕ بە وەعدەی ئەو نەکەی....

هەرچی رەنجێ لەگەڵ ئەوا
بدەی ئەچێ بەبای هەوا
رەزیل ئەبیت و بێ نەوا
باوەڕ بە وەعدەی ئەو نەکەی....

هەزاران گیر و دەسخەڕۆ
ئەکات بە فیشاڵ و درۆ
نەتیجەش پێت ئەڵێ بڕۆ
باوەڕ بە وەعدەی ئەو نەکەی....

خۆتی فیدا کەی هەر کەمە
خەڵاتی ئەو دەرد و غەمە
"بێکەس" بەسیەتی چیت لەمە
باوەڕ بە وەعدەی ئەو نەکەی.....

سلێمانی

# کەرەکانی شێخ سەلام

کەریم، ئەمڕۆ کورتان بۆ تۆ
شەڵتەی جەزا بگرە و بڕۆ
بار هەڵگرە تا نیوەڕۆ
سیاسی بە، زۆر لەسەرخۆ
"بر تۆ هزاران علبە جو"

مودیرەکەی شاری "پێنجوێن"
بە تڕ نابی بە روتبە و شوێن
بە خورماڵیش بۆت ئەخۆم سوێن
تۆ لە کوێیت و ئەوان لە کوێن !
"بر تو هزاران علبە جو"

هەزاری بێ عەقڵ و کەماڵ
بۆ خۆی گەیی بە حاڵ و ماڵ
وەك مودیرەکەی "چەمچەماڵ"
مەئیووس نەبی جاشی مناڵ
"بر تو هزاران علبە جو"

خۆ کەرەکەی "حاجی مامەن"
بە سەد قورئان- باوەڕ بکەن
لەگەڵیا ئیمتیحانت کەن
ناگاتە تۆ بە عیلم و فەن
"بر تو هزاران علبە جو"

چەمچەماڵ

# بەهار نامەوێ.....

بـــەهار نامـــەوێ جوانیـــت ببیـــنم
ئـــەمڕۆ مـــن بـــە دڵ پەســـت و خـــەمگینم
دوورم لـــە خۆشـــی، خـــەریکی شـــینم
زار و بێـــــزارم تاریکـــــە ژیـــــنم
دوژمـــــنی لالـــە و گـــوڵ و نەســـرینم
بـــەهار نامـــەوێ جوانیـــت ببیـــنم

بـــەهار بولبولـــت بـــا هـــەر بخوێنـــێ
گـــوڵیش لـــە دەشـــتا بـــا خـــۆی بنوێنـــێ
کانیـــت ئـــاوی روون بـــا هـــەڵقوڵێنێ
گـــژ و گیـــات هـــەوا بـــا بیـــشەکێنێ
ئەمانـــــە دڵـــــی مـــــن نابزوێنـــــێ
بـــەهار نامـــەوێ جوانیـــت ببیـــنم

بـــەهار و دەشـــت و ئاسمـــانی شـــینی
بولبـــول و قـــومری و گـــوڵ و نەســـرینی
نەشـــئەی دیمـــەنی جـــوان و شـــیرینی
پەشمـــە لای کەســـێ ســـەراپا ژیـــنی
پـــڕ بـــێ لـــە دیلـــی و دەرد و غـــەمگینی
بـــەهار نامـــەوێ جوانیـــت ببیـــنم

# تووشی لافاوی عیلم بووم.......[1]

تووشـــی لافـــاوی عـــیلم بـــووم و بـــەڵام زوو دەرپـــەڕیم
ســـواری واپـــۆڕی جـــەهل بـــووم و بـــەناویا تێپـــەڕیم
سـەد شـوکر ئۆخـەی نـەجاتم بـوو لـە باسـی عـیلم و فـەن
نـــام گـــرن جـــارێکی تـــر بۆیـــە لـــە کـــەیفا هەڵپـــەڕیم
گەرچـــی تـــا ئێـــستا وتوومـــە: تێبگـــەن زوو پـــێ بگـــەن
بەو قـسانەم قەتعییـەن بـاوەڕ مەکـەن، سـەگ بـووم وەڕیـم
خوێنـدەواری شـێتییە، هـەر جەهلـە ئینـسان سـەر ئـەخا
گـــەر لەمـــەولا نـــاوی عـــیلمم بـــرد بـــزانن سەرســـەریم
هێنـــدە تـــەعقیبی هـــەقم کـــرد تـــاکو نـــانی خـــۆم بـــڕی
ســووك و ریـــسوا بـــووم لــە نـــاوا گـــیرەوەی ئـــاخر شــەڕیم
مـــن کـــە زانـــیم حـــاڵی زانـــا نەفیـــە، حەپـــسە، یـــا شـــەقە[2]
هـــەر کیتـــابێکم هـــەبوو دوێنـــێ لـــە داخانـــا دڕیـــم
پیـــاوی دانـــا عـــەقڵی دانـــا زانـــینی بـــۆی ناچـــێتە ســـەر
بـەرگی نـادانی لەبـەر کـرد بـوو بـە خـاوەن زێـڕ و سـیم[3]

---

[1] تەمسیلێك کرا بۆ مەنفەعەتی مەکتەبەکانی سولەیمانی، لەو حەفلەیەدا بە ناوی "زانستی"یەوە چەند شیعرێکم لە لایەن مەعاریفەوە خوێندەوە. لە دوای ئەوە بە چەند رۆژێك لەسەر ئەو شیعرەم نزیکەی ٢٠ رۆژ تەوقیف کرام. بە هەزار حاڵ رزگارم بوو. کە لە حەپسخانە دەرچووم. ئەم شیعرانەی سەرەوەم نووسی. "بێکەس"

[2] من کە زانیم حاڵی زانا: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە"جا کە زانیم حاڵی عاقڵ......تاد".

[3] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخە دا بەم جۆرەیە:
ئیقتیدام بەو کرد منیش بۆیە بە عەقڵمدا تڕیم

# به بۆنەی بۆمبای ئەتۆمەوە

داخەکـــەم بـــۆ ئـــەو زەمانـــەی رووی زەمـــین
وەك بەهەشـــت بـــوو پـــڕ لـــە خۆشـــی و پێکـــەنین
بـــێ تـــەماع و بـــێ درۆ و خـــاڵی لـــە قـــین
دڵنیـــا و، دوور بـــووین لـــە ئۆتـــۆمی لـــەعین
تـــف لـــە عـــیلم و ســـەنعەت و ســـەد کارەبـــا
مەرحـــەبا ئـــەی جـــەهل و وەحـــشەت مەرحـــەبا
یـــادی تـــۆ ئێـــستا لـــە دڵ خـــەم لائـــەبا

عیلمـــە ئێـــستا بۆتـــە مایـــەی دەردیـــسەر
عیلمـــە بۆتـــە واســـیتەی مـــەحوی بەشـــەر
عیلمـــە تەســـخیری ئەکـــەن هـــەر بـــۆ زەرەر
عیلمـــی چـــی؟ وا بـــێ، هـــەزار خۆزگـــەم بـــە کـــەر
بـــا وجـــوودی رادیـــۆ و شـــەمەندەفەر
وا ئـــەبێ پێـــشکەوتن و عـــیلم و هونـــەر
تـــف لـــە عـــیلم و ســـەنعەت و ســـەد کارەبـــا
مەرحـــەبا ئـــەی جـــەهل و وەحـــشەت مەرحـــەبا
یـــادی تـــۆ ئێـــستا لـــە دڵ خـــەم لا ئـــەبا

# گفتوگۆی "بێکەس" لەگەڵ زەمانە

بێکەس:

ئــەی زەمانـــەی بــێ وەفــا تــا کــەی لەگــەڵما خــائینی
دائیمـــەن نارێــك و چـــەوت و عەکـــسی ئامـــالی مـــنی
موددەتێ لای خۆت لەگەڵما وەك بـرا بوویـت ئـەی زەمـان
حـاڵی حـازر لـێم بـەری بـووی، ناحـەز و هـەم دوژمـنی

وەڵامی زەمانە بۆ "بێکەس":

فایقــا تــۆ بــۆچ ئـــەناڵی، بەســـیە ئـــیتر قیـــژە قیـــژ
مــن وەفــام بــۆ کــەس بــووە وا تــۆ خــەریکی شــیوەنی
ســەد هــەزار پیــاوی نــەجیبم خــستە ژێــر بــاری جــەفا
چەند هـەزار پیـاوی بـە سـەروەت مایـەوە خۆی و گـونی

بێکەس:

ئــەو کەســانەی تــۆ ئــەڵێی، هێــشتا لــە بێکــەس چــاترن
چـونکە ژیــنی ئــەو جەفایــە، زەهــری مــارە خــواردنی
پــێم بڵــێ تــۆ بۆچــی دەرحــەق ئــەو کەســانەی عــاقڵن
ئــــەژدیهایت و بــــۆ ئەوانـــەی جــاهیلن هـــەر وەك ژنــــی[1]

---

[1] ئەم کۆپلەیە لە چاپی پێشوودا نییە.

زەمانە:

رۆڵــە تــۆ جــارێ منــاڵی، شــارەزای دنیــا نــەبووی

ســەیری تــەئریخ کــە ئــەزانی گــەر لــە سیلکی خوێنـدنی

شــا "صــلاح الــدین" و "دارا"، خــاوەنی بــاخی ئــیرەم

جوملە فەوتان، بوونـە خـۆڵ و تـۆ لـە حـاڵی نووسـتنی....

زەڕڕەیــەك فــەرقی ئــەم و ئــەو قەتعییــەن لای مـن نییـە

بەســیە تــەحقیر کــردنم، تــۆ تــالیبی شــەڕ کردنــی

بێکەس:

لێــت موحەققــەق بــێ زەمانــە عالــەمێ لێــت عــاجزە

بــێ وەفــای، بــێ مروەتــی، هــەم سەرســەری و پــیس و دەنــی

تاقــەت و مــەیل و بــەقای تــۆ بــۆ کەســێ تــا ســەر نــەبوو

هــەر دەمــێ یــاری یــەکێکی، لایقــی زەم کردنــی[1]

[1] بەیتی دووهەمی ئەم کۆپلەیە و بەیتی سێهەمی کۆپلەی پێشوویش لە چاپی پێشوودا نین. بەیتی یەکەمی ئەم کۆپلەیە لە چاپی پێشوودا دوا بەیتی کۆپلەی یەکەم بوو.

# من و ئیفلاس

مــن و ئــیفلاس و بەدبــەختی و دەری چــاخانە تــا مــردن
مــن و حــوجرە و دەســێ نــوێن و قوتابیخانــە تــا مــردن
بــڕۆ یاهوو موبارەك هەر بە تۆ بێ پاکەتی "ئەرداس"
مــن و کیــسە و ســەبیل و تــووتنی خۆمانــە تــا مــردن
سدارە و قۆندەرە و باستۆن هەمووی بۆ تۆ بێ بۆ چیمە
مــن و تەپلــە و کــڵاش و داری هەورامانــە تــا مــردن
ئــەتۆ و شــەمپانیا و وێسکی، مــن و قــاپی ڕەشــی عــارەق[1]
ئــەتۆ و نــۆتی هــەزار ڕوپیــە و مــن و نــۆ ئانــە تــا مــردن
ئەتۆ و دانس و سەمای تیاترۆ و کەمان و عــوود و قرنایــە
مــن و زوڕنــاو و ســێ پــێیی و دەهــۆڵ لێدانــە تــا مــردن
ئــەتۆ ڕاحــە و مورەببــا و پــسکت و چــوکلێتە خۆراکــت
منــیش باســووق و ســنجووق و پــەنیر و نانــە تــا مــردن
لــەناو قــەومێکی جاهیــل دا ئــەوی یــەك زەڕڕە فکــرێ بــێ
ژیــانی زەحمەتــە "بێکــەس" کــە ســەرگەردانە تــا مــردن

---

[1] ڕەشی عارەق: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "شەرابی ڕەش".

# شینی پانتۆڵەکەم

نەگبەتم دائیم لە دنیا، دەوڵەت و مایەم زیان
گیرەوەی قەهر و مسیبەت عاجز و هەم دڵ فوغان
نەگبەتی وا بۆتە جووتم تووشی سەد دەردم ئەکا
سەیری کە چیم هات بە سەردا موختەسەر ئەیکەم بەیان
من کە پانتۆڵێکی شەعریم دەستگیر بوو داخەکەم
زەڕڕەیەك خێرم نەدی لێی بای موبارەك رای فڕان
ئاه چ پانتۆڵێکی نایاب بوو لە بەرما بێ نەزیر
ساف و بێ چرچ و بە بێ عەیب قیمەتی بیست سی قران[1]
موددەتی دوو رۆژ لە پێم کرد و گەلێ پێوەی گەڕام
جا لە ناو خەڵق و رەفیقان تێر و پڕ خۆمم نوان[2]
عاقیبەت هەر چاوی بەد بوو کاری لێ کرد و نەما
داخی دەرناچێ لە دڵ بە خوا هەتا ئاخر زەمان

سلێمانی

---

[1] بێ عەیب: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "موکەممەل" بیست سی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "هەشتا".

[2] نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
موددەتی دوو رۆژ و نیوم کردە پێ تا عاقیبەت

# شینی "حەلاو"

گیانە رۆیشتی، منت بەجێ هێشت
ئەزانی دوای تۆ چەندم جەفا چێشت؟
قەسەم بە دڵی مات و خەمگینت
بە ڕەنگی زەرد و لەشی بێ تینت
بە دەم و واتەی خۆش و شیرینت
خۆراکم بۆتە شیوەن و شینت

گیانە، من بێ تۆ وێرانە ماڵم
وێڵ و سەرگەردان پەشێوە حاڵم
شیرینیم تاڵی، خۆشیم خەفەتە
دەروون زامدار و جگەر لەتلەتە
لەو رۆژە باڵای تۆ کەوتە ژێر خاک
تاریکە شەوە لام رۆژی رووناک

سلێمانی

# موسابەقەی کەرسواری[١]

خۆتان لابدەن بۆ ئەسپی تازی
با نەختێ بۆتان بکەم رمبازی
بژی کەرەکوڵ چەند نەشئە بەخشی
بە هەیبەت کەری، بە هیممەت رەخشی
قوربانە، سا دەی بێرە چوار ناڵە
هەرچی جۆیەکت خواردبێ حەڵاڵە
رووی خۆت سپی کەی لەناو ئەم خەڵقە
دەخیلە نەم خەی لەم جێگا رەقە
گوێ قوت کەرەوە و کلک راوەشێنە
هەر چێکت تیایە لێرە بینوێنە

[١] لەساڵی ١٩٢٨دا ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ موتەصەڕڕیفی ئەو سەردەمەی سلێمانی سەیرانێکی رێکخست لەو سەیرانەدا پێشبڕکەیەکی کەرسواری کرا، بێکەس یەکێك بوو لە پێشبڕکەکەرەکان و بە سەر پشتی کەرەوە ئەم شیعرانەی دانا.

## سەر دانانەوێنم

مـــن کـــە رازی بم بـــە نـــەختێ عـــەرەق
بـــە چـــۆڕێ چێـــشت و لـــەتێ نـــانی رەق
کەڵکەڵـــەی پـــارەم لـــە ســـەردا نـــەبێ
حـــیرس و تـــەماعم دابێتـــە بـــەر شـــەق
ســـەر بـــۆ هـــیچ کەســـێ دانانـــەوێنم
تەشـــی نارێـــسم بـــۆ پیـــاوی ئەحمـــەق
بـــە نێـــری ئـــەژیم هـــەتاکو مـــاوم
ئەبـــەد لانـــادەم لـــە ســـەر رێگـــەی حـــەق.....

## بە دوو زمان

مــن لــە وەســفی نــاز و لەنجــە و لاری دولبــەر عــاجزم
"وصـــفها صـــعب علـــی، حـــائر فیهـــا القلـــم"
خــۆم لــە بــەر پێــی دا فــڕێ دا و زۆر بــە مــەحزوونی وتم:
"ارحمـــی قلبـــا حزینـــا قـــد اژابتـــە الـــسقم"
پێــی وتم "بێکــەس" خــەیاڵت خــاوە قــەت ناگەیتــە مــن
"قلـــت: رفقـــا هـــل یجـــوز قتلنـــا؟ قالـــت: نعـــم"
لەحزەیــەك گــەر لوتفی دەرحــەق مــن ببێ ئــەو ئەختــەرە
"تعـــدل الفـــردوس عنـــدی دونهـــا روج الارم"

## جەژنی من

جـەژنی مـــن گریانـــە ئـــەمڕۆ، میحنەتـــە جەژنانەکـەم
بـــەرگی مـــن جـــەور و جەفایـــە، شـــیوەنە ســـەیرانەکەم
دڵ کـە نـاخۆش بـوو بـرادەر جـەژنی ئـەو تەعزێیـە هـەر
عالـــەمێ شـــایی بکـــا، مـــن بەســـتەیە گریانەکـــەم
خەڵك هەموو مەسروور و شادن دەستە دەستە دێنـە خـوار
مـن خـەریکی دەردی خـۆمم، تـەرکی نـاو یـاران ئەکـەم

## تێ هەڵکێش......

"قـــل لـــن یبکـــی علـــی رســـم درس"
شـین و گریـان بەسـیە، ئـیتر کاکـە بـەس
وەســـف و یـــادی یـــاری رابـــوردوو مەکـــە
"مثـــل لیلـــي و لبـــیني و خـــنس"
واز لەمانـــــە بێنـــــە، وا رۆی تێپـــــەڕی
"واصـــطبح کرخیـــة مثـــل القـــبس"[١]

سلێمانی

[١] عەرەبییەکان لە شیعری "ابو نواس"ن.

## شیوەنی رابوردوو

زەمانــێ بــوو کـە بـاخی شـێخ وەکـوو بـاخی موعەللـەق بـوو
کەچـی ئێـستاکە پـەژموردە بـە جێگـەی حـاجی لـەق لـەق بـوو
بـــە وێنـــەی تـــاقی کێـــسرایە، ئـــەویش وەك ئـــەم خەراباتـــە[1]
زەمانەی شەوکەوت و عیزی بەسەرچوو جەرگی شەق شەق بوو
لـــە مەجـد و نـــاوی رابـــوردو و شـــەرەف تێفکـــرە جـا بگـــری
لە بۆ ئـەو رۆژە پیرۆزەی کـە چـەند پڕ شـەوق و رەونـەق بـوو[2]
ئەســـیر و ماتـــە ئێـــستاکە لـــە ژێـــر چـــنگی غەزەبدایـــە
لـــە خنکانـــا بـــە بێـــچارە لـــە تـــاوا چـــاوی وا زەق بـــوو
ســـەلاحەددینی ئـــەییووبی کـــە دنیـــا کەوتـــە ژێـــر دەســـتی
سـولالەی ئـالی بابـان بـوو کـە سـاحێب حـوکم و سـنجەق بـوو
هـەموو ڕۆیـین، بـەڵام ناویـان بـەجێ هێـشت بـۆ خـەڵق چـونکە
ئەوی بێ ناو و شوهرەت مرد، موحەققەق گەوج و ئەحمەق بـوو
بـــەڵێ دنیایـــە، وەك بایـــە، جەفایـــە، چەشـــنی خـــەو وایـــە
هـەزار موڵـك و میللـەل فـەوتا هـەزاران تـەختی پـێ لـەق بـوو

## عیلاج و مەرهەمن.....

عـــیلاج و مەرهـــەمن بـــۆ جـــەرگی پـــڕ غـــەم
جـــەمال و دەنگـــی خـــۆش و زوڵـــف و پەرچـــەم
ئەمانـــە قـــووتی رۆحـــن نـــەك هـــەموو ژەم
قووبـــولی و، تاســـکەبابی و تیکـــەی ئیـــزرەم

---

[1] بە وێنەی: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "شەبیهی"
[2] لێرەوە تا دوایی لە چاپی یەکەمدا نییە.

# تاویَ تر ئەمرم

لە سەرەمەرگا ئینسان هەندێ شتی بەخەیاڵدا دێت کە لە هیچ کاتێکدا بە خەیاڵیدا نایەت و بە تایبەتی ئەگەر شاعیر بێت لە غەریبی بێت، وا ماموٚستا ا.ب هەوری پێشانمان ئەدات چوٚن لە ساڵی ١٩٢٥ لە دارالمعلمینی ئیبتدائی لە بەغدا بێکەس لەسەر سەرینی نەخوٚشی بە تەمای خوٚی نەماوە و ئەم چەند شیعرەی نووسیوە.

تـــا ژیـــام ژیـــنم وتـــت زەبـــوون بـــی
گـــەردوون مەرگیـــشم هـــەر ئـــەبێ ون بـــی
بـــێ نـــەخوٚش کـــەوتن بـــێ وەی بـــێ ناڵـــە
بـــێ دەرمـــان خـــواردنی کاغـــەز و پیاڵـــە[1]
بـــێ دکتـــوٚر هێنـــان بـــێ چـــاوەڕوانی
بـــێ گـــەرما و نرکـــەی دەمـــی بـــەیانی
بـــێ کـــەس لـــە ژوور ســـەر بـــێ بـــاوك بـــێ بـــرا
لـــەم ژووره تـــاره بـــێ مـــوٚم بـــێ چـــرا
بـــێ خوشـــك بـــێ دایـــك لـــە ژوور ســـەرینم
بـــە فرمێـــسك بـــشوٚن دووتـــوٚی بـــرینم
بـــێ دولبـــەر جـــارێ بـــێ خـــوٚی بنوێنـــێ
بـــە نـــاز پایـــەی جـــەرگ لـــە بـــنج دەربێنـــێ
بـــێ هـــەوای فێنکـــی گوٚیـــژە و بـــەرانان[2]
بـــوٚ بەرگـــەی ئـــاه و وەیـــشوومەی گیـــان دان
تـــاویَ تـــر ئـــەمرم لـــەم دوور وڵاتـــە
دڵ پـــڕ لـــە خوٚزگـــە و ئـــاخ و ئاواتـــە

---

١ مەبەست لە دەرمانی تەڕ و وشکە.

٢ گوٚیژە و بەرانان دوو شاخن لە سەر و خوارووی سلێمانی.

لاشـــــەكەم بـــــۆ گيـــــان هـــــەتا بـــــەيانى
لەســـــەر چـــــەرپايە و لـــــە ژێـــــر بـــــەتانى

ئەمێنێتـــــــەوە تـــــا جـــــەرەس لێـــــدان
كـــــە زانـــــرا مـــــردووم ئەبێتـــــە ســـــەيران
دەورم لـــــێ ئـــــەدەن قوتـــــابى درشـــــت و ورد
ئـــاو بێـــنن خێـــرا ســـابوون دەســـت و بـــرد
ئەمـــــشۆن بـــــە ئـــــاوى ســـــارد و ســـــابوونى
تەرپێـــــچم ئەكـــــەن بـــــۆ چـــــەند و چـــــوونى
بـــــۆ ئەلحـــــەد كـــــردن لـــــەم خـــــاك و خۆڵـــــە
ئەمنێنـــــە چـــــاڵێ لـــــەم دەشـــــتە چـــــۆڵە
كـــــە جێيـــــان هێـــــشتم بـــــە گريـــــە و زارى
گيـــــان پـــــەرواز ئـــــەكا بـــــۆ خزمـــــەت بـــــارى
ئـــــەڵێ نووســـــراوە لـــــە قـــــەبرم بـــــە خـــــوێن
مـــــن لـــــە قـــــەومێكم بـــــێ رێگـــــە و بـــــێ شـــــوێن
دەردى دوو دڵـــــــــى زەبـــــــــوونى كـــــــــردووين
قـــــازانجى خـــــۆيى و زەم و شـــــەرە جـــــوێن
خوايـــــە تـــــۆ لەبـــــەر پياوچـــــاكانى خـــــۆت
رزگاريـــــان بكـــــە لـــــە زنجـــــير و كـــــۆت
زنجـــــــــير و كۆتـــــــــێ زۆرى نـــــــــەزانى
نايدۆزنـــــــــەوە رێـــــــــى زينـــــــــدەگانى

# یاری من

یــاری مــن غــەدداره بۆیــه رەحــم و ویجــدانی نییــه
چــاو مەســتە زۆر بــه دەســتە دیــن و ئیمــانی نییــه
حیلــه بــازە، زۆر بــه نــازه، عالــەمی گیرۆدەیــه
وەصلی خـۆی کـرد کەچـی هـەر وەعـد و پـەیمانی نییـه
بــێ وەفایــە، پــڕ جەفایــە رۆحــی خــۆی بــۆ فیــدا
کـەم، کەمـە هێـشتا لـه کـن ئـەو تـەبعی ئینـسانی نییـه
مووددەتــێ تــا ئیــشی پــێم بــوو ئیلتفــاتێکی هــەبوو
ســەیرەکەم رووی گــرژە ئێــستاکە مــەیلی جــارانی نییــه
نادروســتە پــوول پەرســتە کــەس نەویــستە بــۆ تــەماع
عاشــقان تێــك بەرئــەدات و بــاکی دۆســتانی نییــه
خــوێن رژێنــه، دڵ شــکێنە، ســەر بــه فیتنــه و شۆڕشــه
هــەر دەمــەی دۆســتی یەکێکــه و یــادی یــارانی نییــه
بەســیه مــردم رەنگــی زەردم شــاهیدی ئــەم حاڵەیــه
نۆکــەری ئــەم شــۆخە ناکــەم لوتــف و ئیحــسانی نییــه

## وەسفی پیرەمەگرون

سـەفایە بـۆ دڵـی غـەمبار و مـەحزوون
شـیفایە بـۆ لەشـی ناسـاغ و کـەم خـوون
ئـەکا عالـەم سـەراپا مەسـت و مـەفتوون
نـزارەی شـاخ و داخـی پـیرە مـەگرون!

خـوڕەی ئـاوی شـەبیهی عـود و تـارە
هەواکـەی سـازگار و مـشکبارە!
درەخـت و دار و بـەردی هـەر خومـارە،
بەهەشـتی مـەوقیعی قـومری و هـوزارە

عـیلاج و مەڵهەمـە بـۆ دەردی ئینـسان
دەلیلـی قودرەتـە بـۆ زاتـی یـەزدان !
نیـشانە و هەیکـەلی بـۆ فـەخری کـوردان،
فیـداکاری خـاکی پاکـت کێـوی لوبنـان!!

## وەسفی تانجەڕۆ

ئـەی تانجـەڕۆ تـۆ کەوسـەری هـەموو خـاکی کوردسـتانی
پـڕ ئـاوی تـۆ سـەر بـەڕزق و خێـرات و پـڕ دەغـڵ و دانـی
وەسـفی تـۆ قـەت نایەتـە تـەحریر و نووسـین
هێنـدە پـڕ فائیـدە و جـوانی، باعیـسی فـەخری کـوردانی
خـوڕەی ئاوەکـەی تـۆ هـەموو غـەمێ لـە دڵ ئـەبا
سـۆزی دووری تـۆ لـە عالـەمێ پـڕ سـروور ئـەکا
مـەنزەرەی ئـاوی تـۆ هـەمتای بەهەشـتی فیردەوس ئـەکا!

## بێزاربوون لە موعەلیمی

نــــەماوە شــــەوق و تاقـــەت، هیـــچم نـــەما لـــە بـــارا
لـــــە ژوورێکـــــا خـــــزاوم دەرناکـــــەوم لـــــە شـــــارا
بـــەیانی تـــاکو مـــــەغریب هـــەر دەرســـی "زارا و زارا"
هۆشـــم نـــەماوە کـــول بـــووم لەگـــەڵ قوتـــابی هـــارا

## قوتابخانەی زانستی

مەقـــسەدی زانـــستی تـــەنها نەشـــری عـــیلم و خوێندنـــە
بـــۆ تـــەرەقی قـــەومی کـــوردان وا لـــە خزمـــەت کردنـــە
جێیـــــەکی پـــیرۆزە بـــــەرزە لابـــەری فیتنـــــە و شـــــەڕە
واســــــیتەی بـــــــەرزی وڵات و دوودڵـــــی لابردنـــــــە

## جەژنە پیرۆزە

ئــەوا جــەژن هــات بــە بــەزم و خۆشــی
عالـــەم شـــەرابی ســـرووری نۆشـــی،
کـــوردی دڵ ســـووتاو لـــەم رۆژە یـــادی
شـــەهید کـــر و ماتـــەمی پۆشـــی.

## چوونە مەیخانە

چـوونە مەیخانـــە هەمیـــشە کـــاری پیـــاوی عاقڵـــە
هــەر کەســێ بێــت و بڵــێ ئــەم ئیــشە عەیبــە جاهلــە
فائیــدەی چــی سەرچــنار و بــاغی تەکیــە و بــەکرەجۆ
مـــەی لـــە مەیخانـــە نـــەبێ لای مـــن حـــەرام و باتڵـــە

# مەئموورەکان ئەوا تیاترۆ هاتەوە

بەشارەت بێ لە گشت ئەفرادی مەئموور
هەموو چاو ڕوون بن و دڵ شاد و مەسروور
لە سایەی خواوە دەرکەوت ڕۆژی پڕ نوور
بەسەر چوو شەو، نەما هەنگامی دەیجوور

شوکر ئەسبابی کەیف و زەوق و عوشرەت
هوجوومی کردە شار بۆ دەفعی میحنەت
کەمان و عوود و قانوون، سەیری قامەت
هەوزارە و قومرییە بۆ باغی عوشرەت

عیلاج و مەڵهەمی بۆ قەلبی پڕ غەم
جەمال و دەنگی خۆش و زوڵف و پەرچەم
ئەمانە هێزی گیانن نەك هەموو ژەم
قوبووڵی و تاس کەبابی و تیکە ئیزرەم

چ ڕۆژێ بوو کە دوێنێ ڕۆژی مەحشەر
خەلایق تێکڕژا بوو جوملە یەکسەر
لەبەر "فیکتۆریا" بوو ئەی برادەر
کە خەڵقی هاتەدەر وەك ریزە عەسکەر

هەموو مەئموور دەماغی بەزم و خۆشی
لیباسی فاخیر نایابی پۆشی
بەیادی ئەم قودوومە جامی نۆشی
بە هیممەت بۆ زیارەت تێ ئەکۆشی

...........عاشقی "فیکتۆریا"یە[1]
لە رێی ئەو دائیما رۆحی فیدایە
بە بێ ئەو ژینی هەر دەرد و جەفایە
موحاسیب یەك دەلیلە لەم لیوایە

رەئیسی بەلەدە وردی تا درشتی[2]
لە داخی هیجرەتا کۆماوە پشتی
وەکوو مەجنوون فیراریان کردە دەشتی
کەوا هاتۆتەوە چاك بۆوە گشتی

موهەندیسمانە تا ئێستا لە شین بوو
سەراپا ئیشکەری مات و حەزین بوو
دەروونی کون کون و زام و برین بوو
کەچی ئەمڕۆ بە خەندە و پێکەنین بوو

مودیری دائیرەی رێژی ئەمین بەگ
لە قەهرا ورگی ئاوسا بوو بە دیبەگ
وجوودی خۆ نەمابوو غەیری دوو رەگ
کەچی ئەمڕۆ کە تۆی دی کەوتە ئاهەنگ

قودوومی ئەو لە بۆ هەر گەنج و پیرێ
خیلاف تیا نەبوو وێنەی نەزیرێ
ئەبێ لەم رۆژە تەئریخێ بگیرێ
لە دەفتەردا بنووسرێ، هەڵبگیرێ

---

[1] لەم شوێنە لە دەستنووسەکەی بەردەستمانا بەر سووتان کەوتبوو.

[2] لە دەسنووسەکەدا نووسرابوو: ورد و درشتی" بەڵام بەوجۆرە بەیتەکە لەنگ نەبوو. بە هەر دوو جۆریش لە باریە رێزمانییەوە ناتەواوە.

رجاتـــان لـــێ دەکـــەم ئـــەی خـــزم و یـــاران
کـــە زۆر تـــێ هەڵنەچـــین وەك جـــاری جـــاران
لەســـــەرخۆ بـــن لــــە ئیـــشێکا کـــە کردتـــان
هــــــــەتاکو زوو نـــــــــەبن لات و پەریـــــــــشان

## (؟)

.............[1]

هــەر کەســێ مــاڵی ســەرف کــرد، لاڤ گــەورەش لــێ بــدا
حــاڵی ئــەو بــێ شــك رەزیلــە، عــەیش و نۆشــی حەســرەتە
مەقــسەد و غایــەم لەوەشــدا موختەســـەر عــەرزت دەکــەم
پێــت لـــە لێفـــەی خـــۆت زیـــاتر رابکێـــشی نەگبەتـــە
ئیقتیـــساد کـــردن لـــە دنیـــا بـــۆ هـــەموو کـــەس لازمـــە
شـێتە "بێکـەس"، بگـرە عـاقڵ نـان ئـەخۆی لـەم حاڵەتـە

---

[1] سەرەتای ئەم پارچە شیعرەش لە دەسنووسەکەی بەر دەستماندا دڕابوو. هەر بۆیەش ناوونیشانمان بۆ دانەنا.

# جەژنی چی؟

"بە بۆنەی ڕووداوەکانی ١٩٤٦ و ١٩٤٧دەوە"

جــەژنێ بــە شــێوەی پەشــێوی و بــە شــین
بـــە ئـــاه و ئـــۆف و بەناڵـــە و گـــرین
بـــە ئـــاوازی دڵ، دڵانـــی غـــەمگین
بــە ئــاهی ســارد و بــە بــرژەی بــرین
ڕازابێتـــەوە، جـــەژنی مـــن کوانـــێ !
کـــوا شـــادی، کوانـــێ، کـــوا کامـــەرانێ!

جـــەژنێ بـــەرزانی دیـــل و دەربـــەدەر
ڕێکـــانی دڵـــسۆز مـــات و قوڕبەســـەر
خوشـــکان لـــە خوێنـــا چـــەقیو تـــا کەمـــەر
بـــۆ هـــەر لا بـــڕۆی شـــین بـــێ سەراســـەر
ئـــەو جەژنـــە کـــۆڕی شـــین و شـــەپۆڕە
دڵ پـــڕ لـــە زام و ژیـــان ســـەر شـــۆڕە

جـــەژنێ نـــوێ جـــەژنی قارەمانـــان بـــێ
یـــادی خۆشـــناو و کاکـــە حەمـــە گیـــان بـــێ
بـــۆ خـــەیری و عیـــززەت شـــین و گریـــان بـــێ
کـــوا جەژنـــە؟ شـــینە، ڕۆژی گریانـــە
کوردســـتان ماتـــەم، هـــەر قـــوڕ پێوانـــە

جەژنێ خۆشەکانی بەرزانی کڵۆڵ
لێ قەوماو، بێکەس، لە شیوو لە دۆڵ
یا لە تەل بەندا لە "دیانە"ی چۆڵ
خواردنیان بەرد و دڕك ودالّ و خۆڵ
ئەو جەژنە رۆژی قاتی و قڕانە
قڕانی کۆرپە و کچی کوردانە

جەژنێ جێی بینین ژووری زیندان بێ
جەژنانەی لاوان کۆتی گران بێ
میللەت هەژار و رووت و بێ نان بێ
شادی و بەزممان جگەر ئێشان بێ
یاخوا ئەو جەژنە بە زەهری مار بێ
گیانم بێ بە خاك، لە راگوزار بێ

جەژنێ جەژنمە خاکی نیشتمان
ژێر چەپۆك نەبێ و بژی کامەران
میللەت تێر و پڕ بەرز و شادمان
دایکان بیسڕن فرمێسکی چاوان
کاتێ جەژن ئەکەم بگەم بە مراد
میللەتم شاد بێت، نیشتمان ئازاد

تۆڵەی لاوانی لە دار دراوم
خوێنی گەنجانی کوردی کوژراوم
بسێنم ئەوسا نانی بڕاوم
دەستگیرم ببێ تابی هەناوم
ئەوسا پڕ بە دڵ ئەڵێم شادییە
ئەڵێم وا جەژنی گەل ئازادییە

## قصيدة عربية الي فتاة سورية

سورية ملكت فوادي بعينيها
ورمتني في بحر الهوى بسهام
انستني كل مليحة كانت لها
سوقا بقلبي وافرا و غرام
جذبت قلوب الاشقين بعينها
جذبا كجذب الشمس للاجرام
يا زهرة العشاق قبلة خدك
تشفي عليلا قلبي بسقام
رحما بقلبي قد غدا متضرعا
كتضرع المسجون للحكام
هذة قصيدة عاشق قد قالها
من قلبه المملو بالالام!!

نظمت في سنة ١٩٣٠

# گۆرانی سپۆرت

یاری کە، را کە، پێکەنە
جلی بێکاری داکەنە
دەماری سستی هەڵکەنە
یاری کە، راکە، پێکەنە

تۆپێن و کەوشەك و شەقێن
یارییەکی زۆر جوان و بەجێن
تەوژم و تین ئەدەن بە خوێن،
یاری کە ، راکە، پێکەنە

داوێنی راستی بەرمەدە
لە یارمەتی خۆت لامەدە
خاو و خلیچك خۆت با مەدە
یاری کە، راکە، پێکەنە

جوانی رەوشت و کردەوە
بۆ ناو و بەرزی پێشڕەوە
بە گورج و گۆڵی سەرکەوە
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

ئەگەر پێویستی خۆتت کرد[1]
گەلت هەموو درشت و ورد
ئەڵێن بژی لاوچاکی کورد
یاری کە، راکە، پێکەنە

سلێمانی ١٩٣٤

[1] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
لەگەڵ فرمانی خۆتت کرد

# شوان و مەڕەکانی[1]

شوان:

مـــــــەڕەکانم چـــــــەند جـــــــوانن
چـــــەند بـــــە کـــــەڵك و بەســــــەزمانن
بـــــڕۆن.... بـــــڕۆن..... بـــــۆ ئەولایـــــە
زۆر لـــــــــەوەڕی چـــــــاکی تیایـــــــە

مەڕەکان:

لـــــــووره‌ی گورگـــــــێ دێتـــــــە گوێمـــــــان
نزیـــــــك کەوتۆتـــــــــەوە لێمـــــــان
ئەگـــــــەر تـــــــۆ زوو نەگـــــــەی پێمـــــــان
ئـــــــەو بـــــــەدخووە دێتـــــــە ڕێمـــــــان

شوان:

لـــــە لـــــوورەی ئـــــەو هـــــیچ مەترســـــن
ئەگـــــــەر لـــــــەو گورگـــــــە ئەپرســـــن
وا ڕای کـــــــــرد و ملـــــــــی شـــــــــکان
"بـــــازە"ی دی، ڕۆیـــــی، تێـــــی تـــــەقان

مەڕەکان:

بـــــــەهارمان هـــــــەر بـــــــۆ بمێنـــــــێ
خـــــــودا تۆمـــــــان لێ نەســـــــێنێ
لـــــە چـــــاکەی تـــــۆ هـــــەر دەرناچـــــین
هـــــەتا مـــــردن گـــــەردن کەچـــــین

[1] لە "لاقراة المصورة" وەرگیراوە.

شوان:

تـــــــاریکی داهـــــــات و شـــــــەوە<br>
جـــــا نـــــۆرەی دۆشـــــین و خـــــەوە<br>
ئـــــــەوا ئـــــــەمڕۆشمان تێپــــــــەڕان<br>
بــــــچینەوە بـــــــۆ دێکـــــــــەمان

مۆرتکە ١٩٣٥/٥/١١

# تۆ چیت؟ من کوردم!

تۆ چیت؟ من کوردم/نەتەوەی کوردم
خۆ ترسنۆك نیت؟/حاشا نەبەردم
چی تۆی لەناو برد؟/دوودڵی و نیفاق
چۆن رزگار ئەبی؟/هەر بە ئیتتیفاق
بڵێ چیت ئەوێ؟ /بەرزیی وەتەنم
بە خۆڕایی نا، /بە گیان و تەنم
چیت لە بارایە؟/خۆ فیدا کردن
بۆچی؟ لە رێگای/میللەتا مردن
کوا، چەکت چییە؟/سەودای ولاتم
ئەی پشتیوانت؟/عەزم و سەباتم
راستت پێ بڵێم؟/فەرموو گوێم لێتە
بە قسەم ئەکەی؟/سەرم لە رێتە
بەڕاستی و پاکی/هەوڵ و تێکۆشین
لە کورسی و کینە و/درۆ چاو پۆشین[1]
ئەمانەت نەبێ/کارت زۆر لەقە
بەشت هەمیشە/نەگبەتی و شەقە[2]

هەڵەبجە ١٩٣٥

[1] کورسی و: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "بوغزو".
[2] نەگبەتی و: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "لێدان و".

# دایك

منالێکی ساوا بووم
کەی وەك ئێستا کە وابووم
دایکم بەخێوی کردم
ئەو نەبوایە ئەمردم

بە لای لایە و گۆرانی
رای ژەنووم تا بەیانی
بە شیری مەمکەکانی
منی بە بەرهەم هانی

رەنجی لەگەڵ کێشاوم
لە باوەشیا دایناوم
بەرگ و جلی بۆ شتووم
خزمەتی زۆری کردووم

چاکەی وا لەبەر چاوم
هەتا لە دنیا ماوم
ئەبێ دڵی نەشکێنم
ئارەزووی بەجێ بێنم

مۆرتکە- ١٩٢٥/١/٢٩

# بەیانی

بەیانییە، وا رۆژهەڵات
شەو پشتی هەل کرد و هەڵات
چیا و دۆڵ و دەشت و دەر
بەرگی رووناکی کردە بەر
زەمین دەمی بە پێکەنین
وەك دولبەرێکی نازەنین
پڕ گوڵ و پڕ لە یاسەمین
پڕ ئەرخەوان و نەستەرین
پەڕندە وا بە دارەوە
بەسەر لقی چنارەوە
بە بولبول و هوزارەوە
بە دەشت و کۆهسارەوە
مەستە خەریکی خوێندنە
ئەڵێ: چ وەختی نووستنە
خەریکی یاری کردنە
هەستە دەم و چاوت بشۆ
کتێبت هەڵگرە و بڕۆ
بۆ مەکتەبت خێرا بچۆ[١]
لە ئێستەوە هەوڵ بدەن
چاوی لە ئێوەیە وەتەن

چەمچەماڵ ١٩٣٧

[١] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیەك
بۆ قوتابخانە زوو بچۆ

# تەمەعکاری

دوو پشیلەی جووت و رێک
هەستان و چوونە جێیەک
بۆ دزی سەلکێ پەنیر
کەوتنە پیلان و تەدبیر
وەختێ تەدبیر رێک خرا
شوێن و رێگا دانرا
چوونە سەری دوو بە دوو
پەنیریان دەسگیر بوو
بۆ تەماع و بەشی زۆر
لێیان بوو بە شەڕ و شۆڕ
تێر و پڕ لە یەکیان دا
تاکو هێزیان لێ بڕا
کاتێ تەواوم ماندوو بوون
شەرعیان بردە لای مەیموون
وتیان ئەتکەینە قازی
هەر دووکمان بکە ڕازی
مەیموون هەستا زوو بە زوو
هێنایە پێش ترازوو
پەنیری لەت کرد بە دەم
بەشێ زۆر و بەشێ کەم
خستیە ئەم سەر و ئەوسەری
ترازووەکەی هەڵبڕی
دەستی کرد بە کێشانی
لایەک گرانی هانی

مـــەیموون قـــەپاڵی لـــێ گـــرت
تـــا بـــە جـــارێ کـــەلی کـــرد
ئـــەمجا بـــچووك بـــوو ســـەرکەوت
ئـــــەوی تریـــــشیان داکـــــەوت
لـــەم پاروویـــەك لـــەو پـــاروو
تـــا پـــەنیری خـــوارد هـــەموو
پـــشیلەکان بـــە بـــێ بـــەش
مانـــــەوە مـــــات و رووڕەش
خۆلاســـــەی ئـــــەم قـــــسانە
تـــــەماعکار پەشـــــیمانە
ئـــــەوی بـــــە دو نارێکـــــە[1]
بـــە دڵ نـــەفرەتی لـــێ کـــە

سلێمانی

[1] بە دو: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "خراپ و".

# یەکیەتی

پیـاوێ کـە خـاوەنی حـەوت
کوڕ بوو، جارێ نەخۆش کەوت
وتـــی: ئــاخری عـــومرم
هـــاتووە رەنگـــە بمـــرم
وا چـــاکە هــــەتاکو هـــەم
کوڕەکـــانم تـــەمێ کـــەم
ڕێیـــەکیان نیـــشان بـدەم
نەکەونــە میحنــەت و غــەم
ئـــەمجا ڕۆژێ لـــــە ڕۆژان
بـــانگی کــــردە هـــەموویان
لـــە لای خۆیـــەوە داینـــان
کەوتــە وەعــز و تــەمێیان
باقەیـــــەك داری دانـــــێ
وتـــی کامتـــان ئــەتوانێ
ئـــەم دارانـــە بــــشکێنێ
هونـــەری خـــۆی بنوێنـــێ
ئــەوانیش لێیـــان وەرگــرت
قسەی باوکیـان لـە گوێ گـرت
هـــەولیان دا بـــۆ شـــکانی
بـــەلام هــەر نــەیان تــوانی
بـــاوك لێـــی وەرگرتنـــەوە
باقەکـــەی بـــۆ کردنـــەوە
هــەر یەکــەی دارێکــی بـرد
زوو شـــکاندی دەســـت و بـــرد

ئـەمجا بـاوك رووی تـێ كـردن
وتـــی رۆڵـــە گـــوێ بگـــرن
ئێـــوەیش گـــەر لـــەم ژیانـــە
جیـــا بـــن وەك ئـــەم دارانـــە
شـــــكاندنتان زۆر ئاســـــانە
پاشـــــەڕۆژتان پەرێـــــشانە
بـەڵام ئەگـەر لەسـەر یـەك بـن
دەرەقـــەتتان نایـــە دوژمـــن
هەمیـــشە بـــەرز و رووســـوورن
سەربەست و شاد و مەسروورن

سلێمانی

# جووتێك كۆتر و بۆقێك

جووتێــك كــۆتری نێــر و مــێ
ئەگــەڕان لــە گــوێ چــەمێ
بــۆقێکی جــوانی ســەر ســەوز
ئەیقیــژان بــە دەنگــی بــەرز
کۆترەکــان حــەزیان لــێ کــرد
تێــڕ و پــڕ گوێیــان شــل کــرد
ســەری خۆیــان بــۆ لــەقان
بــە بــاڵ چــەپڵەیان تــەقان
بۆقەکـــە ئـــەوەی زانـــی
بــوون بــە هــاودەمی گیــانی
زۆر خۆشــیان ئــەبردە ســەر
خۆشــی بــۆ کێیــە تــا ســەر؟!
راوکــەر شــوێنی هــەلگرتن
جێگایــان پــێ تــاڵ کــردن
ئــەفڕین، دوور ئەکەوتنــەوە
ناچــار بــوون بگوێزنــەوە
بــۆق کــە بیــستی، بــە گریــان
وتــی هــەر یــەم لەگــەڵتان
دارێ یـــەکی ســـەرێکیان
بــۆق خــۆی هەڵواســی بــەدان
بــە شــەقەی باڵیــان فــڕین
بەســەر شــارا تێپــەڕین
بــوو بــە هــەڵلا لــە شــارا

وتیـــان چـــۆن بـــۆق باڵـــداره
بـــــۆق هــــات دەم بکاتــــەوە
حـــەزیك بـــوو جـــواب باتـــەوە
دەمــــی بـــەر بـــۆوە لـــە دار
ســـەرنگرێ بـــوو کەوتـــە خـــوار
هەپڕوون بە هەپڕوون بوو مـرد
تێـــر ســـەیری دنیـــای نـــەکرد
ئەمـــــــە حیکایەتێکـــــــە
بـــــۆ پەنــــد و عیبرەتێکـــــە
یـــەعنی ئـــەبێ هـــەر کەســـێ
لەگـــەڵ وەك خۆیـــا هەڵـــسێ.....

## کەڵەشێر

کەڵەشێر ئەڵێ عوو عوو عوو
نوستن بەسە هەڵسن زوو،
نوێژی بەیانیتان چوو
تف لە تەمەڵ و بەدخوو

## سەگ

سەگان ئەڵێن حەو حەو حەو
نانمان بەنێ بژین بەو،
ئێمە پاستان ئەکەین شەو
وەختێ چاوتان چووە خەو

## کەر

کەریش ئەڵێ زەڕ زەڕ زەڕ
حەیوانێکم لاڵ و کەڕ،
ئیشی زۆرتان بۆ ئەکەم،
بەزمانم وەکو مەڕ!!

# شێرۆ و مار

وەرگێڕراوە

شێرۆ کوڕێکی چاکە
زۆر بە ڕەحم و دڵ پاکە
ڕۆژێ لە چلەی زستان
مارێکی دی لە کۆڵان
وا لە سەرما سڕ بووە
بە عەینی وەك مردووە
زۆری بەزەیی پیا هات
وتی من ئەیدەم نەجات
دەس بەجێ مارەی هەلگرت
خێرا بۆ ماڵەوەی برد
ئاگرێکی بۆ کردەوە
مارەی گەرم کردەوە
ئەمجا کە ماری بەدخوو
سەرمای لە بەدەن دەرچوو
چاکەی لە بەرچاو نەما
پەلاماری شێرۆی دا
کوڕ دەستی کرد بە هاوار
باوکەکەی کرد خەبەردار
کەوتە فریای دەست و برد
مارەکەی لەت و پەت کرد
ئەمجا رووی کردە شێرۆ
وتی: رۆڵە ئەگەر تۆ

قسەی من لە گوێ بگری
تووش نابی تاکو ئەمری
"چاکە دەرحەق کەسانێ
بکە کە پێی بزانێ"

سلێمانی

# پشیلە

پشیلە ئەڵێ میاو میاو
نە نانم هەیە نە ئاو،
تیکەیەك نانم بدرێ
با لێت نەکەم بە زووخاو !

# هەرەوەز

کـــوڕێ بـــوو نـــاوی دارا بـــوو
وریـــا و زیـــرەك و دانـــا بـــوو
هەرچـی ئەکەوتــە بــەر چـاوانی
ئەچـــوە بــــنج و بنـــــاوانی
ڕۆژێ ئـــــەوا دیققـــەتی کـــرد
تــــــەنیا مێرووڵەیـــــەکی ورد
لـــە دەنکـــە گـــەنمێ ئـــاڵاوە
زۆر بـــە دەســـتییەوە دامـــاوە
چـــەندی ئـــەکرد بـــۆی نەئـــەبرا
هێـــز و قـــووەتی لـــێ بـــڕا
ئـــەمجا مانـــدوو بـــوو لێـــی دا ڕۆی
هـــی تـــری هێنـــا لەگـــەڵ خـــۆی
چـــوونە ســـەری و کاتـــێ زانـــی
گـــەنمیان بـــرد بـــە ئاســـانی
دارا لەمـــــە عیبرەتـــــی گـــرت
پەنـــدێکی باشـــی لـــێ وەرگـــرت
وتـــی هـــەر کـــارێ گرانـــــە
بـــە هـــەرەوەزی ئاســـانە.....

سلێمانی

# له قوتابخانه

وەخـــتی دەرس لـــە مەکتـــەب
دائەنیـــــشم بـــــە ئـــــەدەب
لـــە دەرســـا تـــیٚ ئەکۆشـــم
چـــاو لـــە یـــاری ئەپۆشـــم
گـــویٚ لـــە مامۆســـتا ئـــەگرم
فائیـــــدەی لـــیٚ وەرئـــــەگرم
دەرســـــەکەم رەوان ئەکـــــەم
رەنجێکـــــی تـــــەواو ئـــــەدەم
تـــا دەربـــچم لـــە مەیـــدان
ســـــبەی رۆژی ئیمتیحـــــان
ئـــــەوی زیـــــرەك و چـــــاکە
لـــە ئیمتیحـــان بـــیٚ باکـــە
بـــەلاّم ئـــەوی بـــیٚ کـــارە
هەمیـــــشە شـــــەرمەزارە

سلێمانی

# گۆرانی کەششافە

ئێمە کەششافەی کوردین
هەموو بە دەست و بردین
بۆ بەجێ هێنانی خزمەت
چوست و چالاك و گورجین

ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەتە
ڕۆژی هەوڵ و هیممەتە
با هەموومان تێ بکۆشین
دەربچین لەم وەحشەتە

ئێمە کە نەوجەوانین
هەر بۆ خزمەت خولْقاوین
بۆ هەموومان لازمە
قەدری وەتەن بزانین

سلێمانی

# فڕۆك

شــتێكی بــێ خــوێن و گیــان
ئــەفڕێ و ئەچــێتە ئاسمــان
هــەڵ دەگــرێ گــەڵێ ئینــسان
دوو بــاڵی پێوەیــە جــوان
ناویــان نــاوە تــەیارە
زۆر مــەحكوم و بــە كــارە
لـــە شـــەڕا مـــسیبەتە
لــە ئاشــتی یــا نیعمەتــە
لــە ســایەی حیرفــەت و فــەن
شــتی وا دروســت ئەكــەن

سلێمانی

# ژماردن

یەك و دوو چەندە ئاسانە
رۆڵە گوێ بگرە و بیزانە
سێ و چوار خۆش و سووكە
كوڕی زیرەك ئێسك سووكە
پێنج و شەش و حەوت بژمێرە
ئازایی خۆت دەرخە لێرە
هەشت و نۆ و دە ڕەوان كە
ئەوسا هەر یاری و سەیران كە...

سلێمانی

# ئێمه منالْین

ئێمـــــه منـــــالْین، وەتـــــەن دایکمانـــــه
مامۆســــتا باوکـــــه، مەکتـــــەب مالْمانـــــه
قوتـــــــابی هــــــەموو وەك برامانـــــــه
کـــوردی خۆشەویـــست نـــووری چـــاومانه
ئـــــەبێ تێکۆشـــــین ئـــــەمڕۆ مەردانـــــه
چـــــونکه کوردســـــتان چـــاوی لێمانـــــه

سلێمانی

# مەتەڵ

بـۆ کەســێکی ورد و وریــا و زیــرەك و ســاحێب عــەقڵ
هــەڵبهێنێ ئــەم ســوئالەم، هــەم بــدا جــوابی بــە دڵ
ئەسـپی بـێ ئێـسقان و رۆحـم لا هەیـە، هـەم بـێ زوبـان
سـووك و خێرایـە لـە ڕۆیـین، مەحکـەم و گـورج و ڕەوان
ئەســپی مــن دائــیم لــە غــارە، بــاکی هیلاکــی نییــە
بــێ خــەو و خــواردن، وە بــێدەنگ، کــا و ئــالیکی نییــە
مەیتــەر و زیــن و تەویلــە، ئــەی بــرا، لازم نییــە
ئــاخوڕ و ڕەشمــە و لغــاوی هــەروەها پێویــست نییــە
فڕکــە فــڕك ڕەوتــی تیــژی هــەر وەکــو بــەرقی بــەهار
نرخــی هــەرزان و بــەتالان، قــایم و دایــم بــە کــار
مـن مەتـەڵ زوو هەڵدەهێنم، هـەم ئـەدەم جوابـت بـە دڵ
"ئەسپە ئاسـنینە"ی بـە کوردی پـێ ئـەڵێن، یـا "پایسکڵ"

# گۆرانی وەتەن

خوایـــە وەتـــەن ئـــاوا کـــەی
چـــەند دلگـــیر و شـــیرینە
دەشـــتی خـــۆش و رەنگینـــە
ئـاوی کەوسـەرە، خـاکی گەوهـەرە
پـــڕ لـــە گـــوڵ و نەســـرینە

ســـــەیرانگای بـــــەهارانی
ســەوزە گیــای نــەرم و جــوانی
ســـەد دڵ ئـــەبێ حـــەیرانی
ئـاوی کەوسـەرە، خـاکی گەوهـەرە
پـــڕ لـــە گـــوڵ و نەســـرینە

شـــاخی بـــەفرین و بـــەرزە
بـــۆ رابوردوومـــان رەمـــزە
چـــیمەنی جـــوان و ســـەوزە
ئـاوی کەوسـەرە، خـاکی گەوهـەرە
پـــڕ لـــە گـــوڵ و نەســـرینە

ئـــەم شـــوێنە شـــوێنی كـــوردە
جێـــــی قارەمــــان و گـــوردە[1]
لانــــەی شــــێری نەبـــــەردە
ئـاوی كەوســەرە، خـاكی گەوهـەرە
پـــڕ لــــە گـــوڵ و نەســـــرینە

وەتـــــەن چـــــاوی لێمانـــــــە
دەری كـــــەین لــــە تەنگانـــــە
حەیفـــــە بێتــــــە وێرانـــــــە
ئـاوی كەوســەرە، خـاكی گەوهـەرە
پـــڕ لــــە گـــوڵ و نەســـــرینە

مورتكەی بازیان ١٩٢٥

[1] گوردە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "مەردە".

# ئەی دلێران

ئـــەی دلێـــران، بێـــچوە شـــێران
بەسیە، هەســتن لـە خـەو ، وا بەیانـە
بـــۆ بـــەرزی قـــەومی کـــورد
تێکۆشـــــن دەســــــت و بـــــرد
چـــاوی لێتانـــە، دایکـــی وەتـــەن

عالـــەم ئـــەمڕۆ هـــەر خەریکـــە
هـــەوڵ ئـــەدا بـــۆ بـــەرزی ژیـــانی
یـــەك گـــرن، پـــێش کـــەون
راپـــــــەڕن، ســــــــەرکەون
چـــاوی لێتانـــە، دایکـــی وەتـــەن

مەکتەبـــە دەرمـــانی ئێمـــــە
خوێندنـــە رەهبـــەری رزگـــاری
هەســـــتن ئـــــەی لاوی کـــــورد
تێکۆشـــــن دەســــــت و بـــــرد
چـــاوی لێتانـــە، دایکـــی وەتـــەن

چارەســــــازان، کاربەدەســــــتان
بۆچـی وا مـات و بـێ دەنـگ و دوورن
ئۆبـــــاڵی قـــــەومی کـــــورد
لـــــە ئەســــــتۆی ئێوەیـــــــە
چـــاوی لێتانـــە، دایکـــی وەتـــەن

# بۆ وەتەن

دڵ لە دەردی وەتەن /پەست و گیراوە
وەك كەوی ناو قەفەس/شەوقی نەماوە
ئەگەر ئەیزانی من/چەند پەرێشانم
شەووڕۆژ ئەی وەتەن/هەر لە گریانم
دڵ فیدای خاكت بێ/گشتی گەوهەرە
بەفیدای ئاوت بێ /چەشنی كەوسەرە
مەنزەرەی كوردستان/بەری بەیانی
پاریس و لوبنان /بێ بە قوربانی
لە جریوەی چۆلەكە/ئاوازی قومری
لە سروەی بای نەسیم/لە خەو هەڵدەسی
ئەی كورد بەسیەتی ئیتر /چیت لە نیفاقە
واسیتەی پێشكەوتنت/هەر ئیتتیفاقە
قەومە هەستە وەك شێر/ئیمڕۆ فرسەتە
بۆ تەرەققی قەومی كورد /رۆژی هیممەتە

# گۆرانی گۆیژە

شاخی رەنگاوڕەنگی گۆیژە باعیسی کەیف و سروور
هەر دەمە بەرگێ ئەپۆشێ، گا سپی، گا سەوز و سوور
وەسفی قەومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو رەنگانەوە
رەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کە قەومێکن جەسوور
بەرگی بێ گەرد و سپی یشت دیارە وا هاوار ئەکا[1]
قەومی کورد دڵ ساف و پاکن میللەتێکن بێ قوسوور
بەرگی سەوزیشت ئەڵێ ئەم خاکە هەر شینایيە
پڕ لە دەغڵ و دان و کانی، سەر بە رزق و پڕ لە نوور
ئەی وەتەن شایانی فەخری واجبە مەدحت بکەم
دار و بەردت عەینی گەوهەر، خاك و خۆڵت وەك بلوور

سولەیمانی

[1] دیارە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە "زاهرا"

## لاوانی وەتەن.....

لاوانـــــــی وەتـــــەن
غیرەتــــــێ بکـــــەن
دەی هەســــتن لەخــــەو
وا بـــە سەرچـــوو شـــەو
نـــــــەما زەمــــــانی
جـــــەهل و نــــــەزانی
ئـــــــەمڕۆ فرســــــەتە
ڕۆژی هیمەتـــــــــــــە
بـــە عـــیلم و ســـەنعەت
بـــــەرز ئـــــەبێ میللـــــەت
عالــــــەم هەمیــــــشە
خـــــــەریکی ئیـــــشە
ئـــیش کـــەن بـــە مـــەردی
بـــە دەســـــت و بـــــردی
یـــــەك دڵ و دەم بـــــن
تـــــا ڕۆژی مـــــــردن
لاوانـــــــی وەتـــــەن
غیرەتــــــێ بکـــــەن

# گۆرانی بۆ مەکتەب[1]

وەتەن هاوار ئەکا ئەڵێ هەستن
ئەمڕۆ رۆژی هەوڵو هیممەتە!
حەیفە نووستن زۆر دواکەوتوون
قەومی دواکەوتوو دیل و نەگبەتە
ئیش کە بە مەردی بە دەست و بردی
بۆ پێشەوە ئەی لاوی کورد

بە خوڵق و کردەوەی شیرین
لەگەڵ یەك وەك برا بژین
بەسیە لە دڵ لابەرن قین
ئێمە دوودڵ بووین دواکەوتین
ئیش کە بە مەردی بەدەست و بردی
بۆ پێشەوە ئەی لاوی کورد

عیلمە میللەت رزگار ئەکا
جەهلە بەجاڕێ وەتەن وێران ئەکا
کوڕگەل هەستن بۆ وا سستن؟
وەتەن وا چاوەڕێتان ئەکا
ئیش کە بە مەردی بەدەست و بردی
بۆ پێشەوە ئەی لاوی کورد

مۆرتکە: ١٩٣٤

[1] ئەم سرووده بە پێی ئاوازەکەی کێشی دێرەکانی دەگۆڕێت.

# بۆ گاڵتەوگەپ

ئەم شیعرانە لە شێوەی قسەکردنی "سەید نووری بەرزنجی کونەکۆتری" دانراوە.

ئــەمن لــە تــەفتیش چـوو لـە کوردســتان
ئــەمن دیــت مــەنزر وەك بــاغ و بیــستان

لــە خـۆم زۆر مــسرور لــە ئــەو مــەنزەرە
ئـــاوی جبـــالی شـــوبهی کەوســـەرە!

گـــولان ئــەو حمــرا "مختلــف الــوان"،
شـــیان تەنـــەزوه دەیکـــەن لـــە خۆیـــان

لـەو سـەنەی مـازی چـومان لـە پێنجـوێن
دیتمـــان زۆر ئەشـــجار خـــزرا و ڕەنگـــین

زۆر پیـاوان گـەورە چـوون لـە ئـەو جێگـا
اســتغراب کردیــان لــەم جەدیــد ڕێگـــا!

دائـــیرە اشـــغال زۆر جەهـــد کـــردی
تـــەریق سـەییارە لـــە پێنجـــوێن بـــردی

ڕەشـــۆڵ موغـــەننی حـــارب دەیکـــردی
قلـــوب عالـــەم جلـــب دەیکـــردی!

ئـــەو موتەصـــەریف حـــازم ئیـــداری
لایـــق لەســـەر ئـــەو کورســـی وەزاری

ئـــەو ســـلێمانی دەیکـــا لـــە جەننـــە،
شەخـــصی موقتـــەدیر صـــاحب الهمـــە!

یـــا رەب مـــستقبل ئـــەم وەتـــەن خۆمـــان
ارتیقـــا بکـــــات کـــسائر بلـــــدان!

ئەم شیعرانەشی لەسەر شێوەی ئاخاوتنی سەید نووری بەرزنجی داناوە.
"بە ناوی قصیدە رائعە للسید نوری الکونە کوتری"

لـــــە خـــۆم بـــو مـــودیر لـــەو ســـلێمانی
مـــــودیر تانــــەوی عەجـــــەب نـــــەزانی

لـــەم ترفیـــع عـــەدوو هـــەموو قـــەهر کـــرد
رغمـــا لـــە ئـــەوان موقـــع لـــە خـــۆم بـــرد

لـــەم ســـەنەی حـــالی زۆر جهـــد دەیکـــەم
لـــــە موعــــــەلیمی زۆر زەرف دەیبــــــەم،

موتەوســـــــــیتە ارتقــــــــا دەیکــــــــا،
ســـــــــائرالویە زۆر غبــــــــز دەیبــــــــا

وەقتـــا کـــە خۆمـــان لـــە خـــارج چـــوومان
لـــەو لیـــوا دلـــێم موفـــەتیش بوومـــان

خـــــدمات جيدييـــــەی ئـــــەوان كــــــردم
لاكــــن مــــــەعاريف موقـــــع لــــێ بــــــردم

قـــــسما باالـلـــــه ئـــــەمن زۆر مـــــــەحزوون
لـــــەم تحويـــــل اخـــــر جـــــدا غــــير مــــەمنوون

چـــــونكه لــــەو بــــلاد مــــــن نييـــــه تاقـــــەت
لازم هـــــەر مەشـــغول لــــه حەمـــــد و تاعـــــەت

تـــــەبع خـــــۆم مائـــــل لــــه كيـــــف و حـــــارب
لاكـــــــن ڤی الڤـــــــاهر تقـــــــی و مـــــــــودب

مـــــن كــــه لەســـــەر خــــۆم دەيكـــــەم عەمامــــــه
لازم تـــــــوزانی ئــــــــەو بـــــــۆ مەرامـــــــــه

ڤی الحقيقـــــــه خــــــــۆم ســــــيد بـــــــەرزنجی
اخــــــلاق و اعمـــــــال خــــــۆم زۆر برنجــــــی

لــــــەو عاصـــــمه خـــــۆ مـــــشهور و معـــــروف
زۆر اســـــــتفادە دەيكــــــــەم لــــــه ظـــــــروف

ئـــــــەو وەتەنيـــــــەكان مفلـــــــس و برســـــــی
نايبـــــەن مثـــــل خـــــۆم لـــــه خۆيـــــان كورســـــی

ئـــەوان حـــەز دەیکـــەن لـــە موشـــاغەبە
ارتقـــا خۆیـــان چـــی موناســـەبە!

چـــــونکە نـــــەزان اصـــــول ادارە
لـــە جمـــع ثـــروەت زۆر بـــێ مهـــارە!

نـــصیحەت دەیکـــەم خـــۆم بەئەوشـــیان
لازم منیـــــە ئـــــەبن لـــــە خۆیـــــان

ئـــەو عـــزت نفـــس بـــلا معیبـــە،
لـــە جمـــع ثـــروەت هەرشـــت مـــصیبە!

ئەمەش بۆ سەید نووری بەرزنجی الکونە کوتری دانراوە!!

ئـــەو ســـــليمانی جـــــدا لطليــــف
ولاســـــيما لــــه فـــصل خريــــف

منــــاخ معتـــــدل اثمــــار مختلـــف
اشـــهد بـــالله لـــه خـــۆم معــــترف

لاكـــن لـــەو بلـــده هـــيچ نييـــه عمـــران
بـــه مرقـــد بـــاوكم مثـــل ســـەر قـــەبران

علـــوا متـــصرف دەبم لـــه يـــەك ســـال
انقـــلاب ســـهول دەيـــده بـــه احـــوال

ئـــەو ســـليمانی دەبـــی لـــه جنـــت
ازدهـــار دەيكـــا لـــه عـــيلم و صـــنعت!

جميـــع شـــوارع تـــەبليط دەيكـــردم،
يـــەك شـــهرەت گـــەورە لـــه خـــۆم دەيـــبردم

ابنيـــة عـــصرى لـــة طـــراز حـــديث
نەشـــر دەيكـــردم تفـــسير و حـــديث

توظـــف نـــەيكا خـــۆم شـــخص خـــرافی
بـــەس يـــەك اشـــارە لـــه عاقـــل كـــافی

ئـــەم بلـــد حـــالی مظـــره حزینـــه
لازم حــــدائق لــــه ئــــەو مدینـــــه!

خـــۆم بعـــون اللـــه زۆر امـــل دەیکـــەم
ئـــەو دقـــت زانـــی چـــۆن عمـــل دەیکـــەم

مثـــل هـــەموو شـــت لـــەو منـــصب جدیـــد
اقـــتراح ئەیکـــەم یـــەك فكـــر ســـدید

طبعـــا خـــۆم عـــالم لـــه لوغـــەت كـــوردی
عـــــده قـــــراة ترجمـــــه كـــــردی

بعـــض لـــه اشـــخاص مثـــل خـــۆم عاقـــل
لـــەو لـــسان كـــوردی زۆر عـــالم فاضـــل

تـــشویقات ئەیكـــەم بـــه ئـــەوان هـــەر جـــار
تـــالیف حـــالی خـــۆم بیكـــەن انتـــشار!